د. هادی عەلی

# ڕەوتی ئیسلامی و پرسی چاکسازی

## لە سایەی شۆڕشەکانی گەلانی ناوچەکەدا



پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی ٢٣

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی



شۆڕش و ڕاپەڕینە جەماوەرییەکانی وڵاتانی عەرەبی، سەرچاوەیەکی لەبنەهاتووی ئیلهامبەخشن بۆ نووسەران و بیرمەندان لە سەرتاسەری جیهاندا، بۆ نووسین و توێژینەوە لەبارەی هۆکار و پاڵنەرەکانی ئەو شۆڕشانە و ئامانجەکانی جەماوەری ڕاپەڕیو. گەورەیی و کاریگەریی ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینانە لە ئاستێکدان کە هاندەرن بۆ چاوخشاندنەوە بە یاساکانی گۆڕین و چاکسازیی کۆمەڵایەتی..

بەندەش بەش بە حاڵی خۆم، لە چەندین بۆنە و وێستگەی جیاجیادا، لە دوای سەرهەڵدانی ئەو شۆڕشانەوە، وتار و توێژینەوە و چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنیم پێشکەش کردووە و لە کەناڵ و چاپەمەنییە ناوخۆییەکانی هەرێمدا بڵاوکراونەتەوە. هەر وەك بەشی یەکەم و دووەمی لە لایەن پرۆژەی تیشکەوە لە نامیلکەیەکدا بە چاپ گەیەنراوە. بەڵام لەبەر گرنگیی بابەتەکان و پەیوەندییان پێکەوە و بەردەوامبوونمان لەسەر نووسین و توێژینەوە لەبارەی شۆڕشەکان و سەرکەوتنیان و ڕۆڵ و بەرپرسیارێتی ڕەوتی ئیسلامی لەو بوارەدا، پێمان باش بوو دوای پێداچوونەوە و دەستکاریکردنی پێویست، هەمووی پێکەوە و لە دووتوێی ئەم کتێبەدا بە چاپ بگەیەنین.

د. هادی عەلی

ڕەوتی ئیسلامی و پرسی چاکسازی

لە سایەی شۆڕشەکانی گەلانی ناوچەکەدا

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
(٢٣)

# ڕەوتی ئیسلامی و پرسی چاکسازی
## لە سایەی شۆڕشەکانی گەلانی ناوچەکەدا

نووسینی:
د. هادی عەلی

چاپی یەکەم
١٤٣٤ ك                    ٢٠١٣ ز

بسم الله الرحمن الرحيم




**ناوی کتێب: ڕەوتی ئیسلامی و پرسی چاکسازی لە سایەی شۆڕشەکانی گەلانی ناوچەکەدا.**

**نووسینی: د. هادی عەلی.**

**لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی و**

**سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی، ژمارە (٢٣).**

**لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٣٢٧)ی ساڵی (٢٠١٣)ی دراوەتێ.**

**چاپی: یەکەم – سلێمانی – ٢٠١٣.**

**چاپخانە: شڤان.**

**تیراژ: (١٠٠٠) دانە.**



**ئیمەیلی پەیمانگا: iiitkurdistan@yahoo.com**

# پێشەکی

شۆڕش و ڕاپەڕینە جەماوەرییەکانی وڵاتانی عەرەبی، سەرچاوەیەکی لەبنەنەهاتووی ئیلهامبەخشن بۆ نووسەران و بیرمەندان لە سەرتاسەری جیهاندا، بۆ نووسین و توێژینەوە لەبارەی هۆکار و پاڵنەرەکانی ئەو شۆڕشانە و ئامانجەکانی جەماوەری ڕاپەڕیو، بە تایبەتی لاوان و نەوەی نوێ، لە بەرپاکردنی شۆڕشەکان و ئامادەیی تەواویان بۆ بەخشینی گیان و خوێنی خۆیان و ڕووبەڕووبوونەوەی دەسەڵاتە دیکتاتۆرەکان و دەزگا و دامەزراوە ئەمنی و سەربازییە داپلۆسێنەرەکانیان. گەورەیی و کاریگەریی ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینانە لە ئاستێکدان کە هاندەرن بۆ چاوخشاندنەوە بە یاساکانی گۆڕین و چاکسازیی کۆمەڵایەتی و تێڕامان لە نهێنیی سەرهەڵدانی شۆڕش و ڕاپەڕینی جەماوەری دژ بە ستەم و دیکتاتۆریەت و ناعەدالەتی.

بەندەش بەش بە حاڵی خۆم، لە چەندین بۆنە و وێستگەی جیاجیادا، لە دوای سەرهەڵدانی ئەو شۆڕشانەوە، وتار و توێژینەوە و چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنیم پێشکەش کردووە و لە کەناڵ و چاپەمەنییە ناوخۆییەکانی هەرێمدا بڵاوکراونەتەوە. هەر وەك بەشی یەکەم و دووەمی لە لایەن پرۆژەی تیشکەوە لە نامیلکەیەکدا بە چاپ گەیەنراوە. بەڵام لەبەر گرنگیی بابەتەکان و پەیوەندییان پێکەوە و بەردەوامبوونمان لەسەر نووسین و توێژینەوە لەبارەی شۆڕشەکان و سەرکەوتنیان و ڕۆڵ و بەرپرسیارێتی ڕەوتی ئیسلامی لەو بوارەدا، پێمان باش بوو دوای پێداچوونەوە و دەستکاریکردنی پێویست، هەمووی پێکەوە لە دووتوێی ئەم کتێبەدا بە چاپ بگەیەنین، بە مەبەستی سوودلێوەرگرتنی باشتر و زیاتر.

**باسەکە لە چوار بەشی سەرەکی پێکهاتووە:**

بەشی یەکەم تایبەتە بە توێژینەوەیەکی زانستییانە سەبارەت بە گرنگیی ڕێبازی گۆڕین و چاکسازیی ڕاستەقینە و سووڕی ژیانی دەوڵەت و سیستمە سیاسییەکان لە تیۆرەکەی ئیبن خەلدوندا. هۆکارەکانی سەرکەوتن یان سەرنەکەوتنی پرۆژەکانی گۆڕین و چاکسازی بە شێوەیەکی گشتی.

لە بەشی دووەمدا تیشك خراوەتە سەر: ڕۆڵ و ڕێبازی بزاڤە ئیسلامییە هاوچەرخەکان، لە نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردوو بەدواوە و هۆکارەکانی سەرنەکەوتن یان دواکەوتنی بزاڤە ئیسلامییەکان لە گەیشتن بە ئامانج لە کاتی خۆیدا و ناچاربوونی جەماوەری ئەم وڵاتانە، بە تایبەتی نەوەی نوێ، بە تێپەڕاندنی نوخبە فیکری و سیاسییەکان و پەنابردنیان بۆ شۆڕش و ڕاپەڕینی جەماوەری دژ بە دیکتاتۆرەکان.

بەشی سێیەم تایبەتە بە شیکردنەوەی هۆکار و پاڵنەرەکانی شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبی و خستنەڕووی ئاماژە و دەرهاویشتەکانی شۆڕشەکان.

بەشی چوارەم تایبەتە بە ڕۆڵ و بەرپرسیارێتیی ڕەوتە ئیسلامییەکان لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشەکان و گرتنە دەستی دەسەڵات لەم وڵاتانەدا و چۆنێتی مامەڵەکردنیان لەگەڵ پرسی دەوڵەت گرنگی سەرکەوتنیان لە پێشکەشکردنی نموونەی حوکمڕانێتیی باش و مۆدێرن، کە وەڵامدەرەوەی ئامانجی شۆڕشەکان و داخوازییەکانی گەلانی ناوچەکە بێت.

خوای گەورە ڕێنیشاندەرمان بێت...

**نووسەر**

**ئەیلولی ٢٠١٢**

# بەشی یەکەم:
# ڕێبازی گۆڕین و چاکسازیی ڕاستەقینە

## گرنگیی ڕێباز و مەنهەجیەتی کار

پێش ئەوەی ڕاستەوخۆ بچینە سەر باسی شۆڕش و ڕاپەڕینە جەماوەرییەکان و ڕۆڵ و کاریگەریی ڕەوتە ئیسلامییەکان لەوبوارەدا، بە پێویستی دەبینم کە لە تەوەری یەکەمدا و لە دید و بۆچوونی بیرمەندان و زانایانی کۆمەڵناسی و تیۆرەکانی گۆڕین و چاکسازیی کۆمەڵایەتی، توێژینەوەیەکی زانستییانە بکەینە دەستپێکی کتێبەکە. چونکە ڕێباز و مەنهەجیەتی چاکسازی و گۆڕانسازی جەوهەر و ناوەرۆکی فیکری سیاسیی هەر کۆمەڵ و بزاڤێکی سیاسییە، ئەو کۆمەڵ و بزاڤە سیاسییە هەر جۆرە مەرجەعیەتێکی فیکری و ئایدۆلۆژیی هەبێت. ئەو ڕێبازەی کە بزاڤە سیاسییەکان دەیگرنەبەر لە پرۆسەی چاکسازی و گۆڕانسازیدا، فاکتەرێکی بنچینەییە لە دیاریکردنی چارەنووس و ئاکامی هەرکام لەو بزاڤانە بەرەو سەرکەوتن و گەیشتن بە ئامانجەکانی، یان شکست و پەراوێزبوونی.

بزاڤە سیاسییەکانیش وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ کێشە و (تحدی)یەك، یان قەیرانێك دروست دەبن، کە لەسەر ئاستی ناوخۆ یان دەرەوە، ڕووبەڕووی گەل و نەتەوەکەیان وەیان کۆمەڵگەکەیان دەبێتەوە. بزاڤە بەرهەڵستکارەکان وەڵامدانەوەیەکن بۆ کێشەی داگیرکاری و خەباتکردن لەپێناو ڕزگاربوون لە داگیرکاری، هەروەك بزاڤە دیموکراسییەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دیکتاتۆریەت و ستەمکاریی سیاسی دێنە کایەوە. دیارە کە بزاڤە چاکسازیخوازەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گەندەڵی و ناعەدالەتی و ستەمی کۆمەڵایەتی دروست دەبن.

لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا زۆر گرنگە کە هەرکام لەو بزاڤ و بزوتنەوانە سروشت و پێکهاتەی گەل و کۆمەڵگەکەیان بە چاکی دەرك کردبێت، چونکە لە ئەنجامدا

بزاڤە سیاسییەکان ڕۆڵەی لەدایکبووی نیشتیمان و کۆمەڵگەکانی خۆیان دەبن و هەڵگری تایبەتمەندی و سیفەتەکانی دەبن لە ڕووی مێژوویی و دیمۆگرافی و کولتووری و سیاسییەوە. وەك ئاماژەشمان پێکرد، پرۆسەی چاکسازی و گۆڕانسازی لە هەلومەرجی قەیران و کێشە و (تحدی)دا پێویست دەبێت، هەروەك گوتاری چاکسازی و گۆڕانسازی بە شێوەیەکی سروشتی پێویستە پشت بە بیرۆکە و ئایدۆلۆژیایەك ببەستێت کە روئیایەکی ڕۆشن و بەڵگەی بەهێز و کاریگەر بداتە دەستی ڕێبەرانی بزاڤە سیاسییەکە بۆ قەناعەتکردن بە لایەنگران و جەماوەرەکەیان، هەر لەو ڕوانگەشەوە ڕێباز و مەنهەجیەتی بزاڤەکەیان دادەڕێژن.

بۆیە زۆر گرنگە سروشت و ماهیەتی ڕێبازی هەر حیزب و بزاڤێکی سیاسی، ئەگەر چاکسازیخوازە یان گۆڕانخوازە، بە لای کەمەوە لای کادری سەرکردایەتی و ناوەندی ئەو بزاڤە، تاڕادەیەکی باش ڕۆشن و مەفهوم بێت، چونکە لەو چوارچێوەیەدا ستراتیژیەتی کار و هۆکارەکانی گەیشتن بە ئامانجەکان دیاری دەکەن و لە قۆناغە جیاجیاکاندا و لە ئاست پێداویستیی ڕووبەڕووبوونەوەکاندا گۆڕانکاریی پێویست و گونجاو لە ستراتیژی کاردا ئەنجام دەدەن.

دیارە ڕێبازی بزاڤی چاکسازی ئەو ڕێبازەیە کە پشت دەبەستێت بە چاککردنی واقیع و باشکردنی بەبێ پەنابردن بۆ گۆڕینی ڕیشەیی، بانگەواز دەکات بۆ ئازادی و دیموکراسی و ڕووبەڕووبوونەوەی گەندەڵی و هێنانەدیی یەکسانی و دادپەروەری بۆ سەرجەم هاووڵاتیان، لە ڕێگای ململانێ و کێبڕکێی سیاسییەوە لە چوارچێوەی پرنسیپەکانی گەمەی دیموکراسی و هۆکارە دەستوری و یاساییە ڕێگە پێدراوەکانەوە، کە گرنگترینیان بریتییە لە هەڵبژاردنە گشتییەکان.

بەڵام ڕێباز و مەنهەجیەتی بزاڤی گۆڕانسازی ئەو ڕێبازەیە کە داوای گۆڕینی ڕیشەیی و چاکسازیی ڕاستەقینە دەکات و بۆ ئەم ڕێبازەش دوو قوتابخانەی لە یەك جودا هەیە: یەکەمیان داوای گۆڕینی ڕیشەیی و ڕادیکاڵی دەکات بەبێ هیچ پێشەکی و زەمینەسازییەك. بەشداربوون لە هەر پرۆسەیەکی چاکسازی لە

چوارچێوەی پرنسیپەکانی دیموکراسی و هۆکارە دەستورییەکاندا ڕەتدەکاتەوە و پشت دەبەستێت بە بەکارهێنانی هێز و شۆڕش بەرپاکردن دژ بە واقیعەکە.

هەرچی قوتابخانەی دووەمە جیاوازییەکەی لەوەدایە کە لە هەمانکاتدا داوای گۆڕینی ڕیشەیی و چاکسازیی ڕاستەقینە دەکات، بەڵام سوود لە هەموو ئەو هۆکار و شێوازە ڕێگاپێدراوانەش وەردەگرێت کە زەمینە ساز دەکەن بۆ گەیشتن بە قۆناغی گۆڕین و چاکسازیی ڕیشەیی. لە کاتی پێویستیشدا سوود لە هۆکارە سەروو دەستوورییەکانی وەك مانگرتنی گشتی و یاخیبوونی سەرتاسەری وەر دەگرن.

لەو سۆنگەیەوە دەکرێ بزاڤە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بکەین بە دوو بەشەوە: بزاڤە چاکسازییە گۆڕانخوازەکان و بزاڤە چاکسازییە موحافیزکارەکان. دیارە کە شۆڕش و ڕاپەڕینی جەماوەریی گەڵ جیاوازیی زۆری هەیە، چونکە شۆڕش بە تەنها سیستمی حوکمڕانیی دەوڵەت ناگۆڕێت، بەڵکو کار دەکات بۆ گۆڕینی ڕیشەیی لە سیستمی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا. شۆڕشەکانیش یان شۆڕشی سیاسین، کە دژ بە ڕژێمە دکتاتۆر و ستەمکارەکان بەرپا دەبن، یان شۆڕشی کۆمەڵایەتین، کە لە شێوەی پرۆسەیەکی کەڵەکەبووی درێژخایەندا دێنەکایەوەو سەرەنجام بە شۆڕش و گۆڕانی سیاسی کۆتایی دێت.

ئاشکرایە کە هەموو شۆڕشێك بە شێوەیەکی ئاسایی ڕێگە خۆش دەکات بۆ گۆڕان و گۆڕانیش زەمینە ساز دەکات بۆ چاکسازیی ڕیشەیی و ڕاستەقینە. ئەوەش ڕاستە کە لە گشت حاڵەتێکدا کلیل و دەروازەی شۆڕش یان گۆڕانسازی وەیان چاکسازی ڕاستەقینە، بریتییە لە مەیدانی سیاسی و بانگەشە کردن بۆ لابردنی ئامرازەکانی داپڵۆسین و چەوساندنەوە و ڕووخاندنی دیوارەکانی ترس و تۆقاندن لە نێوان جەماوەر و دەسەڵاتە ستەمکارەکاندا. هەر ئەوەش دەبێتە دەستپێکی دروست و گونجاو بۆ سەرکەوتنی بزاڤی گۆڕانسازیی و چاکسازی ڕاستەقینە بە گشت ڕەهەندەکانیەوە.

سروشت و پێکهاتەی بزاڤی چاکسازیخواز و گۆڕانخواز پێویستە چۆن بێت و هۆکار و فاکتەرەکانی سەرکەوتن یان شکستیان لە چیدایە؟ ئایا بانگەوازی پێغەمبەران بە گشتی و پێغەمبەری ئیسلام بە تایبەتی (دروودی خوای لەسەر بێت) ڕێبازی ئیسلاحی گۆڕانخواز بووە یان ئیسلاحی موحافیزکار بووە؟ بزاڤە ئیسلامییەکانی ئەم سەردەمە تا چ ڕادەیەك توانیویانە ڕێبازی هاوشێوەی ڕێبازی پێغەمبەری ئیسلام (دروودی خوای لەسەر بێت) بگرنەبەر؟ خاڵی لاواز و بەهێزیان لە چیدایە؟ هۆکاری دواکەوتنی سەرکەوتنیان و ناچاربوونی جەماوەری وڵاتەکانیان بۆ بەرپاکردنی ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبی بۆچی دەگەڕێتەوە؟ ئامانجی سەرەکیی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی گەلان لەو وڵاتانەدا چییە؟ ڕۆڵ و بەرپرسیارێتیی ڕەوتی ئیسلامی لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشەکان و بە تایبەتی دوای ئەوەی کە بە شێوەیەکی دیموکراسییانە دەسەڵاتیان گرتووەتە دەست، لە چیدایە و چۆن مامەڵە لەگەڵ (تحديات)ـە جیاوازەکاندا دەکەن؟

ئایا لایەنەکانی ڕەوتی ئیسلامیی کوردستان لەمیانەی ئەو هەموو گۆڕانکاری و پەرەسەندنانەدا، خۆیان لە کوێدا دەبیننەوە و لەمەودوا چۆن مومارەسەی ڕێبازی ئیسلاحیانەی خۆیان دەکەن؟

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە و چەندین لایەنی تری پەیوەست بەم مەسەلەیە، لە دووتوێی ئەم توێژینەوەیەدا بە کورتی ڕووندەکەینەوە.

## سوڕی ژیانی دەوڵەت و بزاڤە سیاسییەکان

فەیلەسوف و کۆمەڵناسی ناودار لە مێژووی ئیسلامیدا (ئیبن خەلدون)، لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (المقدمة) سوڕی ژیانی دەوڵەت و دەسەڵاتە سیاسییەکان،

وەك سوڕی ژیانی هەر مرۆڤ و گیانلەبەرێك سەیر دەكات [1] بەو شێوەیەی كە لە قورئانی پیرۆزیشدا ئاماژەی بۆكراوە: (اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفاً وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْقَدِيرُ) (الروم: ٥٤).

دیارە ئەوەی كە لەبارەی دەوڵەتان و سیستمە سیاسییەكانەوە دەوترێت، بە شێوەیەك لە شێوەكان حیزب و بزاڤە سیاسی و كۆمەڵایەتییەكانیش دەگرێتەوە. چونكە هەر وەك مرۆڤەكان و دەوڵەتەكان بە قۆناغەكانی منداڵێتی و لاوێتی و پاشان پیربووندا تێدەپەڕن، بە هەمان شێوە بزاڤ و حیزب و ڕێكخراوەكانیش بەو قۆناغانەدا تێدەپەڕن و سەرەنجام پیربوون ڕوویان تێ دەكات و ئەوانیش سوڕی ژیانی خۆیان تەواو دەكەن.

ئاشكرایە كە هەر بزاڤ و ڕێكخراوێك سەرەتا وەك بیرۆكەیەك لە لایەن كەسێك یان چەند كەسێكەوە دەستپێدەكات، پاشان گەشە دەكات و لە چوارچێوەی بەرنامە و هۆكار و ئامانجەكانیدا گەڵاڵە دەبێت و دەگاتە هەرەتی لاوێتی. لەم قۆناغەدا هێز و كارایی و حەماسەتی ئەندامەكانی بۆ قوربانیدان و بەخشین و تێكۆشان دەگاتە لوتكە و ڕێگای لە بەردەمدا دەكرێتەوە بۆ سەركەوتن و گەیشتن بە بەدیهێنانی ئامانجەكانی. خۆ ئەگەر بە پێچەوانەوە نەیتوانی لە كاتی خۆیدا سەركەوتن بەدەست بهێنێت، بە هۆی ناڕوونیی ئامانجەكانی یان پاشەكشە كردنی لە ڕووبەڕووبوونەوەدا، یان سەردانەواندنی زیاد لە پێویست بۆ دەسەڵاتی ستەمكار، یان بە هۆی ساردبوونەوە و خۆ خەریككردن بە كاری لاوەكیی نادروستەوە، ئەوكاتە حەماسەت و گیانی بەرخۆدانی ئەندام و لایەنگرانی بزاڤەكە

[1] عبدالرحمن ابن خلدون، المقدمة، دار الهيثم- القاهرة، ط١/٢٠٠٥، الفصل الرابع عشر/ في ان الدول لها أعمار كما للاشخاص، ص١٣٦.

کاڵ دەبێتەوە و قۆناغی لاوێتی بە خێرایی بەسەردەچێت و پیربوون ڕووی تێ دەکات.

کەواتە لە ڕوانگەی شیکردنەوەکەی ئیبن خەلدونەوە، دەکرێ بڵێین هەر بزاڤ و ڕێکخراوێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی سوڕی ژیانی بە یەکێك لەم دوو ئاراستەیە تەواو دەکات، یان درێژە پێ دەدات [٢]:

ئاڕاستەی یەکەم بەم شێوەیە دەبێت:

– قۆناغی سەرهەڵدان و گەشەکردن لە ڕووی فیکری و ڕێکخراوەییەوە.

– قۆناغی گەنجێتی و هەبوونی ئامانجی ڕۆشن و ئامادەیی تەواو بۆ خەبات و بەخشین.

– قۆناغی سەرکەوتن و گەیشتن بە بەدیهێنانی ئامانجەکان.

– پاشان خۆنوێکردنەوە و بەردەوام بوون بە گیان و حەماسەتێکی کاریگەرەوە.

بەڵام دیارە کە ئاڕاستەی دووەم بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:

– قۆناغی سەرهەڵدان و گەشەکردن.

قۆناغی لاوێتی و درێژبوونەوەی زیاد لە پێویست، بە هۆی نەگەیشتن بە ئامانج، یان بە هۆی ناڕۆشنبوونی ئامانجەکانی، یان نەبوونی ئامادەیی پێویست بۆ خەبات و بەخشین و ڕووبەڕووبوونەوە.

– سەرەنجام قۆناغی پیربوون و ناتوانایی بۆ خۆ نوێکردنەوە و پەراوێز بوون و جێگا چۆڵکردن بۆ لایەن و هێزی تر.

ترسناکترین کۆسپ کە دێتە ڕێگای هەر بزاڤ و ڕەوتێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی، ئەوەیە کە دوای تێپەڕبوونی ساڵان و کاتێکی دوورودرێژ، نەتوانێت

---

[٢] د. جاسم سلطان، فلسفة التأريخ- الفهم الاستراتيجي للتأريخ، دار النشر أم القرى، سلسلة مشروع النهضة، ص٣٥.

بگاتە سەرکەوتن و بەدەستهێنانی ئامانجەکانی. قووڵایی مێژوویی هەمیشە خاڵی هێز نابێت، بەڵکو لە حاڵەتێکدا خاڵی هێز دەبێت کە بزاڤەکە بەردەوام لە گەشەکردن و بەرەو پێشچووندا بێت و یەك لە دوای یەك ئامانجەکای بەدی بهێنێت و قۆناغ لە دوای قۆناغ هەنگاوی بەرچاو بەرەو پێشەوە بهاوێت. خۆ ئەگەر نەیتوانی پلە لە دوای پلە بەرەو پێشەوە بڕوات و ئامانجەکانی بەدی نەهێنا، ئەوا کاردانەوەی سەلبی دەبێت لەسەر بزاڤەکە و نائومێدی و ساردبوونەوە ڕوودەکاتە ئەندامان و لایەنگرانی، چونکە قوڵایی لەم حاڵەتەدا دەبێتە بارگرانی لەسەری و ڕووبەڕووی چەندین پرسیار دەبێتەوە و مۆتەکەی شکست خواردن و پاشەکشە و دواکەوتن بە شێوازی جیاجیا، یەخەی دەگرێت و ناهێڵێت بەسەر کۆسپ و (تحديات)ەکاندا زاڵ ببێت و بگات بە سەرکەوتن. لەم بارەیەوە نووسەری ناوداری میسری (موحەممەد حەسەنەین هەیکەل) لەبارەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە دەڵێت: (٣)

(ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وڵاتێکی بەختەوەرە، چونکە زۆرێك لە جوگرافیا و کەمێك لە مێژووی هەیە). مانای وایە داهات و سامانێکی بێپایانی هەیە، بەڵام هیچ بارگرانییەکی مێژوویی لەسەرنییە. هەر لەبەرئەوەشە کۆچکردن بۆ ئەمریکا مەرجدارە بە وازهێنان لە ڕابردوو و سەرلەنوێ دەستکردن بە ژیانێکی پڕئومێد بەرەو ئایندەیەکی گەش.

هۆکارەکانی پیربوونی هەر بزاڤ و ڕێکخراوێکی سیاسی، بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ چەقبەستنی بیروڕا و لاواز بوونی پەیوەندیی نێوان ئەندامانی ڕێکخراوەکە، یان سەرکردنە ڕابواردنی لە سنوور بەدەر و دوورکەوتنەوە لە بنەما و ئامانجە ڕاستەقینەکان و تەسلیم بوون بە واقیعە نەخوازراوەکە، کە بێگومان جۆرێك لە ساردبوونەوە و خووگرتن بەو حاڵەتەوە دروستدەکات، بە شێوەیەك کە

---

[٣] محمد حسنين هيكل، الزمن الامريكي من نيويورك الى كابل، ط٥، دار الشروق، القاهرة، ص٢٥.

گۆڕین و چاكسازیی ڕیشەیی و دەرباز بوون لەو واقیعە خراپە، بە ئەستەم سەیر بكرێت. بۆیە پێویستە بەردەوام خوێنی نویٚ و بیروبۆچوونی نویٚ و بەهێزكردنی گیانی دەستپێشخەری و بیركردنەوە لە گۆڕینی شێوازی كار و میكانیزمی كار، بهێنرێتە كایەوە.

ئیبن خەلدون لە توێژینەوەكەیدا بۆ سوڕی ژیانی دەوڵەتەكان، زیاتر باس لە دەوڵەتە بچووكەكان دەكات. وەك نموونەی دەوڵەتی خێڵ[٤] (دولة القبيلة)، چونكە لەو ڕۆژگارەدا ئەو فۆرمە لە دەوڵەت باو بووە و پێی وایە كاتێك خێڵ دەسەڵاتی بەدەست نییە، پەیوەندیی خوێن و خزمایەتی لەنێوان ئەندامانی خێڵەكەدا بەهێز و توندوتۆڵە و زیاتر لە حاڵەتی سادەیی و خاكێتیدا ژیان بەسەردەبەن. بەڵام كاتێك ئەو خێڵە دەسەڵات دەگرنە دەست و دەوڵەت پێكدەهێنن، بەشێك لە سەركردە و ئەندامەكانی سەردەكەنە خۆشگوزەرانی و ژیانی پڕ عەیش و نۆش و كەم كەم ساردبوونەوە ڕوویان تێدەكات و ئەو پەیوەندییە بەهێزەی جارانی نێوان ئەندامانی خێڵەكە بەرەو كاڵبوونەوە دەڕوات و هۆكارەكانی لاوازی و پیربوون ڕوودەكاتە دەوڵەتەكە، پاشان بەرەو داڕووخان مل دەنێت و خێڵێكی تر دێت و شوێنەكەیان پڕ دەكەنەوە.

دیارە ئەم بۆچوون و دەرەنجامەی ئیبن خەلدون سەبارەت بە دەوڵەتی خێڵ، لەم سەردەمەدا ڕوودەكاتە حیزب و بزاڤە سیاسییەكانیش. هەر بۆیە فرەیی حیزبی و ئاڵوگۆڕی ئاشتییانەی دەسەڵات، زەرورەتێكی جەوهەرییە بۆ ژیانی گەل و كۆمەڵگەكان. چونكە گەل و كۆمەڵگە پێویستە بەردەوام لە گەشەكردن و پێشكەوتندا بێت و چارەنووسی نەبەسترێت بە چارەنووسی تاكە حیزب و ڕەوتێكی سیاسییەوە. دیارە هەر حیزب و هێزێكی سیاسی بە هۆی مانەوەی درێژخایەنی لە دەسەڵاتدا، دووچاری هەموو جۆرە گەندەڵییەك دەبێت و

[٤] د. جاسم سلطان، فلسفة التأريخ، المصدر السابق، ص٣٧.

هۆکارەکانی لاوازبوون و پیربوون ڕووی تێ دەکات و ناتوانێت وەك پێویست ڕێبەرایەتیی گەل و وڵات بکات بەرەو ئاسۆکانی پێشکەوتن و گەشەکردنی بەردەوام، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێتە هۆکاری دواکەوتن و لاوازبوونی کۆمەڵگە و گەل و نیشتیمان.

ئەم دیاردەیە بە شێوازی جیاجیا ڕوودەکاتە هەر حیزب و بزاڤێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی، تەنانەت پێش گرتنە دەستی دەسەڵاتی سیاسیش. بۆیە بەردەوام پێویستیان بە گۆڕانکاری و خۆ نوێکردنەوە و هێنانە پێشەوەی خوێنی نوێ و لاو دەبێت، بۆ ئەوەی دووچاری لاوازبوون و پیر بوون نەبن.

هەر لەو میانەدا ئیبن خەلدون توێژینەوەی زیاتر و قووڵتر لەبارەی خێڵ و دەوڵەتی خێڵەوە دەکات و ئاماژە بەوە دەکات کە پەیوەندیی خزمایەتی و خوێن کە لەنێوان ئەندامانی سەر بە هەرخێڵێکدا هەیە، بەس نییە بۆئەوەی دەوڵەتی گەورەی لەسەر دابمەزرێت. بەلای ئەو زانا کۆمەڵناسە بیر تیژەوە، دەوڵەتی گەورە پێویستی بە پەیوەندییەکی فراوانتر هەیە، کە لەسەر بنەمای فیکرە یان ئاین دامەزرابێت.

بێگومان ئەو بڕوای وایە کە ئیسلام دەتوانێت ئەو پەیوەندییە فراوانە دروست بکات، کە خەڵکێکی زۆر و هەمەچەشنە لەخۆ بگرێت. ئەوەش ئاماژەیەکە بۆ ئەو پەیوەندییەی کە لەم سەردەمەدا ئەندامانی هەر حیزب و بزاڤێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی پێکەوە دەبەستێتەوە، پێویستە بە شێوەیەك بێت کە بتوانێت زۆرینەی ئەندامانی کۆمەڵگە بگرێتەوە. لەم ڕوانگەیەوە ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت کە حیزب و کۆمەڵی ئایدۆلۆژی ناتوانێت ببێتە حیزبێکی جەماوەریی فراوان و گۆڕانکاریی گەورەی پێ ناکرێت.

## ڕۆڵی فیکرەی مەرکەزی و فیکرەی هاندەر

هەر بزاڤ و پرۆژەیەکی چاکسازیخواز و گۆڕانخواز، پێویستی بە فیکرە و فەلسەفەیەکی مەرکەزی هەیە و هاوزەمانیش پێویستە فیکرە و ئامانجی هاندەر و هیوابەخشی هەبێت، کە جێگای بایەخ و خواستی جەماوەر بێت.(٥) فیکرەی مەرکەزی بریتییە لەو مەرجەعیەت و بنەما گشتییانەی کە هەر بزاڤ و ڕەوتێك پشتی پێ دەبەستێت، بۆ دیاریکردنی دنیابینیی خۆی و داڕشتنی بەرنامە و پرۆژەی سیاسی و ڕێبازی کارکردنی لەناو کۆمەڵگەدا.

بەڵام بیرۆکە و ئامانجی هاندەر (أفكار محفزة) بریتییە لەو هۆکار و ئامانجانەی کە هانی هەڵگرانی فیکرە مەرکەزییەکە دەدەن بۆ خەبات و قوربانیدان و بەخشین. ئەو ئامانجانەی کە ڕاستەوخۆ چارەسەری کێشە و خواست و پێداویستییە هەستپێکراوەکانی جەماوەر دەکەن، وەك گیانی ئاین پەروەری یان نەتەوە پەروەری، یان خەبات لەپێناو دەستەبەرکردنی ئازادی و یەکسانی و دژایەتیکردنی ستەم و گەندەڵی و ناعەدالەتی و ڕووبەڕووبوونەوەی داگیرکاری دەرەکی.

هەبوونی ئەو دوو مەسەلەیە پێکەوە، بۆ هەر بزاڤ و پرۆژەیەکی ئیصلاحی و گۆڕانخواز، پێویستییەکی جەوهەری و گرنگە. بێگومان پێکەوە گونجانی ئەو دوو مەسەلەیە، کاریگەریی گەورەی دەبێت لەسەر سەرکەوتن و بەرەوپێشچوونی هەر بزاڤ و ڕەوتێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەکتیڤکردنی جەماوەر بۆ خەبات و کۆبوونەوە لە دەوری بزاڤەکە و بەشداربوونیان بە شێوەیەکی کارا لە پرۆسەی گۆڕانسازی و چاکسازی و گەشەپێدانی وڵاتدا.

---

[٥] د. جاسم سلطان، قوانين النهضة، القواعد الاستراتيجية في الصراع والتدافع الحضاري، ص١٢.

دیاره كە سێ جۆر فەلسەفە و فیكرەی مەركەزی و سەرەكی هەن، كە بوونەتە مەرجەعیەت بۆ زۆربەی زۆری بزاڤ و سیستمە سیاسییەكان لەم سەردەمەدا. ئەو سێ بیرۆكە و فەلسەفە مەركەزییەش ئەمانەن:

- **لیبرالّیزم:** كۆمەڵگە ڕۆژئاواییەكان بە ئەمریكاشەوە، كردوویانەتە چوارچێوەی فەلسەفی و مەرجەعیەتی ژیانی سیاسی و كۆمەلآیەتی، لەسەر ئاستی تاك و كۆمەڵگە و سیستمە سیاسییەكانیان. ناوەرۆكی لیبرالّیزمیش بەندە لەسەر بنەمای ڕەخساندنی زۆرترین و باشترین دەرفەت بۆ ئازادیی تاك و پاراستنی لە هەیمەنە و ستەمی دەوڵەت و پێشخستنی بەرژەوەندیی تاك بەسەر بەرژەوەندی كۆمەڵگەدا.

- **كۆمۆنیزم:** كە پشت بەستووە بە فەلسەفەی ماركسیزم. بە پێچەوانەی لیبرالّیزمەوە، كار دەكات لەسەر كەمكردنەوەی ڕۆڵی تاك لە بەرژەوەندیی كۆمەڵگە. بۆ ئەو مەبەستەش داوا دەكات دەوڵەت كۆنترۆڵی هەموو بوارەكانی ژیان بكات، بە تایبەتی هۆكارەكانی بەرهەمهێنان. تاك دەبێتە پارچەیەكی بچكۆلە لە مەكینە زەبەلاحەكەی دەوڵەتی پرۆلیتاریا.

- **ئیسلام:** كە پەیامێكی ئاسمانییە. كار دەكات لەسەر دەستەبەركردنی هاوسەنگی لەنێوان بەرژەوەندیی تاك و كۆمەڵگەدا و هێنانەدی دادپەروەری بۆ تاكەكان و كۆمەڵگە بە گشتی.

بەلآم دیارە كە ئەو سێ فیكرە و مەرجەعیەتە مەركەزییە، هەموویان بە شێوازی جیاجیا دان دەنێن بە چەمكەكانی ئازادی و یەكسانی و دادپەروەری و پێكەوەژیان و مافەكانی مرۆڤ و.. تاد. ئەو چەمكانە لەخۆیاندا مایە و هۆكاری ناكۆكی و كێشە نین لەنێوان ئەو سێ فیكرە مەركەزییەدا، بەلآم جیاوازی لە چۆنێتیی تێڕوانین و بەرنامەی دابەزاندنیاندایە بۆ سەر واقیع و ژیانی تاك و كۆمەڵگەكان. ئاشكرایە كە هەركام لەو سێ مەرجەعیەتە ڕوانگەو بەرنامە و تێگەیشتن و بۆچوونی تایبەت بە خۆیان هەیە بۆ هەریەك لەوچەمكانە.

بۆ ئێمەی کۆمەڵگە موسڵمانەکان، ئاشکرایە کە هەریەك لە لیبرالیزم و کۆمۆنیزم زادە و هەڵقوڵاوی فەلسەفەو فیکری ڕۆژئاواییەن، کە دابڕاوە لە هەر پاشخان و بنەمایەکی ئاسمانی و هیچ ڕەهەندێکی غەیبی و پیرۆزیان نییە و لەسەر بنەمای مادی گەرایی و دونیا گەرایی دامەزراوە، کە ئەوەش جەوهەری عەلمانیەتی ڕۆژئاوایە و زیاتر لەگەڵ کولتوور و دابونەریتی کۆمەڵگەکانی خۆیاندا دەگونجێت.

بەڵام ئیسلام کە سەرچاوەکەی (وحي)ی خواییە و چواردە سەدەیە ئاینی کۆمەڵگە موسڵمانەکانە و بووەتە سەرچاوەی کولتوور و مەرجەعیەتی ژیانی تاك و کۆمەڵ، بۆیە جێگای خۆیەتی کە هەر بزاڤ و ڕەوتێکی چاکسازی و گۆڕانسازی لەناو کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا، پشت بە ئیسلام ببەستێت وەك فیکرەی مەرکەزی و مەرجەعیەتی ژیان، لەبەر دوو هۆکاری گرنگ [٦]:

**یەکەم:** لەبەرئەوەی کە ئیسلام ئاینی کۆمەڵگە موسڵمانەکانە و ناکرێ فەلسەفە و فیکرەیەکی تر بکرێت بە مەرجەعیەت و فیکرەی مەرکەزی و لە ڕووی دینییەوە کارێکی نادروستە.

**دووەم:** لەبەرئەوەی کە هەڵبژاردنی ئیسلام بەرژەوەندیی خودی بزاڤەکە و کۆمەڵگەشی تێدایە. چونکە شارەزایان و پسپۆڕانی بواری زانستی کارگێڕی و کۆمەڵناسی، کاتێك باس لە پرسی گەشەپێدان و چاکسازی دەکەن لەناو هەر دەزگا و ڕێکخراوێکدا، جەخت لەسەر ئەو ڕاستییە دەکەنەوە کە ئەو پرۆژە و بەرنامەیەی کە لەسەری دەڕۆن، پێویستە گونجاو بێت لەگەڵ سیستەمی بەها بنچینەییەکانی کۆمەڵگەدا. چونکە لەحاڵەتی ئیختیارکردنی هەر پرۆژە و بەرنامەیەکی تر کە نەگونجاو بێت لەگەڵ سیستەمی بەها بنەڕەتییەکانی کۆمەڵگەدا، دژایەتییەکی توند و نەخوازراو لەو نێوەندەدا دروست دەبێت و دەبێتە هۆی شکستهێنان و لەباربردنی پرۆژەکانی گەشەپێدان و چاکسازیی ڕاستەقینە.

---

[٦] نفس المصدر، ص٢٠.

هەڵبژاردنی ئیسلام وەك فەلسەفە و فیکرەی مەرکەزی، ناکۆك نابێت لەگەڵ سوودوەرگرتن لە بەرهەمەکانی داهێنان و پێشکەوتنە فیکری و سیاسی و کارگێڕییەکانی کۆمەڵگەکانی سەر بە هەردوو مەرجەعیەتەکەی تر، هەروەك ئاسایی و سروشتییە کە بە شێوەیەکی فراوان سوود لە بەرهەمی زانست و تەکنۆلۆژیای وڵاتە پێشکەوتووەکان وەردەگرین.

ئەوەی کە پێویستە هەموان لەسەری کۆك بین، ئەوەیە کە فیکرەی مەرکەزی بۆ هەر پرۆسەیەکی گۆڕانسازی و چاکسازیی، هەتا باشتر گونجاو بێت لەگەڵ سیستمی بەهاکانی کۆمەڵگەدا، ئەوا پرۆسەی گۆڕانسازی و چاکسازییەکە سەرکەوتووتر دەبێت و خێراتر دەگات بە ئامانجەکانی.

لەلایەکی ترەوە گرنگە ئەو ڕاستییەش بزانین کە هەڵبژاردنی ئیسلام وەك فیکرەی مەرکەزی و مەرجەعیەت لە لایەن هەر بزاڤێکی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە بە تەنها، بەس نییە بۆ زامنکردنی سەرخستنی پرۆسەی گۆڕانسازی و چاکسازی، بەڵکو زۆریش پێویستە کە لە پاڵ ئەوەدا فیکرە و ئامانجی هاندەری هەبێ و کێشە و دۆزێکی جێگای بایەخی جەماوەری کردبێتە ئامانج و ناوەڕۆکی گوتاری سیاسیی خۆی. بۆ کۆکردنەوەی جەماوەر و جۆشدانیان بۆ خەبات و بەخشین لەپێناو سەرخستنی پرۆسەی چاکسازی و گۆڕانسازیدا.

بۆ نموونە، نەك تەنها ئاساییە، بەڵکو زۆر گرنگ و زەرورییە کە هەر بزاڤێکی چاکسازی و گۆڕانسازی، کە ئاینی ئیسلامی کردبێتە مەرجەعیەتی خۆی، خەبات بکات لەپێناو هێنانەدیی دادپەروەری و دابینکردنی ئازادی و یەکسانی و ئاوەدانکردنەوەی وڵات و گەشەپێدانی کۆمەڵگە و ڕووبەڕووبوونەوەی ستەمکاریی سیاسی و گەندەڵیدا. هەموو ئەو چەمك و ئامانجانە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بکرێتە ئامانج و ناوەڕۆکی گوتاری سیاسی و هۆکاری هاندانی جەماوەر بۆ خەبات و تێکۆشان و کۆکردنەوەی جەماوەر لە دەوری هەر بزاڤێکی سیاسی کە چاکسازی ڕاستەقینە و گۆڕانسازی بکاتە بەرنامە و پرۆژەی سەرەکیی خۆی. چونکە ئەو

چەمك و داخوازییانەی سەرەوە، هەموویان ئامانج و (مقاصد)ی شەرعین لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، بە تایبەتی چەمکی دادپەروەری کە ئامانجێکی بنەڕەتی و گشتییە لە ئیسلامدا و ئامانجی سەرەکییە لە ناردنی سەرجەم پێغەمبەران (درووود و سەلامی خوایان لەسەر) وەك قورئانی پیرۆز ڕاشکاوانە جەختی لەسەر دەکاتەوە: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ...) (الحديد: ٢٥). وشەی (القسط) مانای دەستەبەرکردنی دادپەروەرییە بۆ سەرجەم مرۆڤەکان.

## سێ توێژە گرنگەکە

هەر بزاڤێکی چاکسازیخواز و گۆڕانخواز، بۆ تەواوکردنی پرۆژەکەی و گەیشتن بە سەرکەوتن، پێویستی بە سێ توێژی جیاوازی یەك لە دوای یەك لە خەڵك و جەماوەر هەیە. چونکە بۆ هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی بزاڤەکە، دەبێ توێژی تایبەت و گونجاوی خۆی هەبێ. ئەو سێ توێژەش ئەمانەی خوارەوەن:[(٧)]

١- توێژی دەستپێکردن (شريحة البدء).

٢- توێژی گۆڕین (شريحة التغيير).

٣- توێژی بنیاتنان (شريحة البناء).

**توێژی یەکەم:** کە پێشی دەوترێت (توێژی مۆلەق- الشريحة القلقة) بەو مانایەی کەسانێك هەبن کە خەمخۆری و نائارامی بەرامبەر قەیران و (تحديات)ێك ڕووی کردووەتە وڵات و کۆمەڵگە، ببێتە خاڵی هاوبەشی نێوانیان و لەسەری کۆببنەوە. دەگونجێت تاکەکانی ئەم توێژی دەستپێکە، سەر بە چین و توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵگە بن، بەڵام هەموویان بۆ هەمان خەم و ئارەزوو و بۆ گەڕان بە دوای ڕێگا چارەیەك و ڕزگاربوون لەو قەیرانە پێکەوە کۆدەبنەوە. دیارە کە

[٧] ياسر الغرباوي، حركات التغيير والحراك الجماهيري، ط١، ٢٠٠٧، ص٢١.

ئەم گرووپ و توێژە خۆیان بە تەنها لە توانایاندا نابێت هەڵسن بە سەرخستن و ئەنجامدانی پرۆژەی چاکسازی و گۆڕانسازی، بەڵام ڕۆڵێکی گرنگ و جەوهەری دەگێڕن لە دامەزراندن و بانگەشەکردن و کۆڵنەدان و هەوڵدان بۆ گەیشتن بە توێژی گۆڕین.

ئەم توێژی دەستپێکە کات و ڕۆڵی دیاریکراو و سنووورداری تایبەت بە خۆی هەیە. ئەگەر زیاتر لەوە درێژ بووەوە و نەگەیشت بە کۆکردنەوە و ڕێکخستنی توێژی دووەم، کە توێژی گۆڕینە، ئەوا بێگومان ئاراستەی درووستی خۆی لێ تێکدەچێت و دووچاری لێشێوانی فیکری و سیاسیش دەبێت.

**توێژی دووەم:** ئەو خەڵکەیە کە بە دەوری ئەو فیکرە و پرۆژەیەدا کۆدەبنەوە کە توێژی یەکەم بانگەشەی بۆ دەکەن و لە توانایاندا دەبێت کاری جیددی بکەن بۆ بەدەستهێنانی ئامرازەکانی گۆڕانکاری و گەیشتن بە ئامانج، کە بریتییە لە گرتنە دەستی دەسەڵاتی سیاسی. دیارە بە هاوکاری و تەواوکاریی نێوان هەردوو توێژی دەستپێك و توێژی گۆڕین، چونکە توێژی دەستپێك بە شێوەیەکی سەرەکی ڕۆڵی بەردەوام دەبێت لە هەڵسان بە ئەرکی ڕێبەرایەتیکردن.

**توێژی سێیەم:** ئەم توێژە وێڕای دوو توێژی یەکەم و دووەم، سەرجەم توێژ و چینەکانی کۆمەڵگە دەگرێتەوە بۆ بەشداربوون لە پرۆسەی بنیاتنانی وڵاتدا، دوای لادانی ڕژێمە دکتاتۆر و ستەمکارەکان. هەروەك لە حاڵەتی سیستمە دیموکراسییەکاندا، ئاشکرایە کە بزاڤە سەرکەوتووەکە هەڵدەسێت بە جێبەجێکردنی پرۆژە و بەرنامەی ڕاگەیەنراوی خۆی. لەم قۆناغەدا پێویستە بنکەی بەشداریکردن فراوان بکرێت، بۆئەوەی سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵگە بگرێتەوە بە جیاوازیی ئینتیمای فیکری و سیاسی و ئیتنییان. هەرهەموو پێکەوە لە چوارچێوەی پەیمانێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی نوێدا، دەبنە بەشێك لە هۆکار و ئامرازەکانی پرۆسەی بنیاتنانەوە و گەشەپێدانی وڵات.

لەم قۆناغەدا بزاڤە سەرکەوتووەکە بە هەموو شێوەیەك پێویستە کار بکات بەپێی پێڕەو و سیاسەتێکی میانڕەوانە و کراوە. خۆی لابدات لە گرتنەبەری هەر جۆرە ڕێوشوێنێك کە ببێتە مایەی پەراوێزخستنی بەشێك لە کۆمەڵگە و ناچارکردنیان بەوەی کۆسپ و تەگەرە دروست بکەن لە ڕێگای هێنانەکایەی حاڵەتی سەقامگیری و زەمینە خۆشکردن بۆ بەجێگەیاندنی پرۆسەی گەشەپێدان. چونکە لەم قۆناغەدا پەنابردن بۆ هەر سیاسەت و هەڵوێستێکی نادروست و هەڵە، بە ئاراستەی دژایەتیکردنی بەشێك لە کۆمەڵگە و دوورخستنەوەی هەندێك و تۆمەتبارکردنی هەندێکی تر، ئەوا بەدڵنیاییەوە هەڕەشەی جیددی دروست دەبێت لەسەر پاراستنی سەرکەوتنەکە و زەمینە ساز دەبێت بۆ ئاژاوە و تێکچوونی باری ئاسایش و حاڵەتی سەقامگیری، کە زۆرگرنگ و پێویستە بۆ بەئەنجام گەیاندنی پرۆسەی چاکسازی و گۆڕانسازیی ڕاستەقینە و سەرخستنی پرۆژەکانی گەشەپێدان.

سەبارەت بە ڕۆڵ و کاریگەرێتی هەریەك لەو سێ توێژەی باسمان کردن و تێپەڕاندنی قۆناغەکانیان یەك لە دوای یەك بە شێوەیەکی سروشتی و ئاسایی، فاکتەری کات زۆرگرنگە و ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی دەبێت لە سەرکەوتن یان شکستخواردنی هەر بزاڤێکی چاکسازیخواز و گۆڕانخوازدا. چونکە هەر بزاڤ و ڕێکخراوێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی، ئەگەر تێڕوانینی ڕۆشن و دروستی لەم بارەیەوە نەبێت، ئەوا ساڵانێکی دوور و درێژ بەردەوام دەبێت لەسەر پرۆسەی کۆکردنەوەی ئەندامان و لایەنگران، بەبێ هەبوونی روئیایەکی ڕۆشن و ستراتیژێکی ڕوون لەبارەی قۆناغەکانی ڕێگا. لە حاڵەتێکی وەهادا بزاڤەکە قیبلەنوما و ئاراستەی خۆی لێ دەشێوێت و لە جێگای خۆیدا ڕادەوەستێت، بەبێ ئەوەی هەوڵی جیددی بدات بۆ تێپەڕاندنی قۆناغی یەکەم و گەیشتن بە توێژی گۆڕین و بەدەستهێنانی سەرکەوتن و بەئەنجام گەیاندنی پرۆژەی چاکسازی و گۆڕانسازی.

لەم حاڵەتەدا شارەزایان و پسپۆڕانی بواری چاکسازیی سیاسی و کۆمەڵایەتی، پێیان وایە کە هەر بزاڤێکی چاکسازیخواز و گۆڕانخواز، بەبێ گەیشتن بە توێژی گۆڕین لە کات و دەرفەتی خۆیدا، ئەوا بزاڤەکە دەگۆڕێت بۆ بزاڤێکی [8] خێرخوازی و پەروەردەیی و ناتوانێت بزاڤێکی چاکسازیخوازی کاریگەر بێت و گۆڕانکاریی گەورە و ڕیشەیی پێ ناکرێت. دیارە ئەوەش بۆخۆی دەبێتە (تحدی)یەکی نەخوازراو، لەهەمان کاتیشدا مەترسییەکی گەورە ڕوودەکاتە ڕێبەرانی بزاڤەکە، چونکە گەیشتن بە توێژی گۆڕین یان ئەو توێژە زێڕینەی کە پرۆسەی گۆڕانی پێ ئەنجام دەدرێت، زامنی مانەوە و بەردەوامبوونی بزاڤەکەیە بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن و گەیشتن بە ئەنجامەکانی.

## تیشکێك لەسەر ئەزموونی پێغەمبەر (د.خ) لەم بوارەدا

باشترین نموونەی چاکسازی و گۆڕانسازیی ڕاستەقینە کە لە مێژوودا ڕوویدابێت و هەموو بزاڤە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بتوانن بیکەنە سەرمەشق و سوودی لێ وەربگرن، بە تایبەتی بزاڤە ئیسلامییەکان، بریتییەلە ئەزموونی پێغەمبەری ئیسلام (دروودی خوای لەسەربێت) وەك قورئانی پیرۆزیش ڕێنمایی موسڵمانان دەکات بۆ وەرگرتنی سەرمەشق و پێشەنگ بوون لە ئەزموون و ڕێبازی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت): (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيراً) (الأحزاب: ٢١).

لە ئەزموونی پێغەمبەری ئیسلامدا ئەوەبوو کە هەر لە سەرەتاوە لە شاری مەککە دەستیکرد بە دروستکردنی توێژ و ئەڵقەی یەکەم، کە پێی دەوترێت توێژی دەستپێك (شريحة البدء)، لەو کەسانەی کە ئامادەیی تەواویان هەبوو لەو قۆناغە هەستیار و دژوارەدا ئەو فیکرە و پەیامە هەڵبگرن و قوربانیی بێوێنەی لەپێناودا

[8] د. جاسم سلطان، قوانين النهضة، المصدر السابق، ص٨٤.

بدەن و دواتر ناونران (المهاجرون). بەڵام کاتێك دڵنیابوو کە لەناو شاری مەککە و دەوروبەریدا، ناتوانێت بگات بە دروستکردن و کۆکردنەوەی توێژی گۆڕین، ئەو توێژەی کە دەبێتە زامن بۆ سەرخستنی پەیامەکەی و گەیشتن بە ئامانج، ئەوەبوو دوای هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر لەگەڵ سەرجەم هۆزەکانی تری ناوچەی حیجاز و دەوروبەری شاری مەککە، تا دەگاتە شاری (طائف) کە نزیکەی (٧٠کم) لە مەککەوە دوورە. لەوێ نەك تەنها بە دەستی بەتاڵ گەڕایەوە، بەڵکو دووچاری ئازار و دەرکردنیش بووەوە. بەڵام بەبێ کۆڵدان بەردەوام بوو لەسەر هەوڵدان و گەڕان بە دوای ڕێگا چارەدا، تا ئەوەبوو لە ساڵی دەیەمی پێغەمبەرێتیدا لە وەرزی حەجدا، ڕێی کەوت لە ژمارەیەك لە خەڵکی شاری مەدینە کە ئامادەیی تەواویان دەربڕی بۆ پشتیوانیکردن و هاوکاریکردنی و بوون بە هەوێنی دروستبوونی توێژی گۆڕین، کە زۆرینەی خەڵکی شاری مەدینە بوون و لە مێژووی ئیسلامیدا بە (الأنصار) ناسراون.

دوای کۆچکردنی بۆ شاری مەدینە، پێغەمبەری مەزن (دروودی خوای لەسەر بێت) ڕاستەوخۆ دەستی کرد بە کۆکردنەوە و ڕێکخستنی توێژی سێیەم لە خەڵکی شاری مەدینە و دەورووبەری، بە هۆزەکانی جولەکەشەوە. هەموو پێکەوە توێژی (بنیاتنان – شريحة البناء) یان پێکهێنا و بەپێی پەیمانێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی کە بە (صحيفة المدينة) ناسراوە و شێوەیەکە لە دەستوور و قانوونی ئەساسیی ئەم سەردەمە، هەموو لایەك ڕێکەوتن لەسەر پێکەوە ژیان و ڕێکخستنی کاروباری ئیداری و ئاسایشی خۆیان بە سەرکردایەتی پێغەمبەری ئیسلام و بەوەش بەردی بناغەی دەوڵەتی ئیسلامی بۆ یەکەمجار لە مێژوودا بە کردەیی دانرا.

دوای تێپەڕاندنی مەترسییەکان لەسەر مانەوە و سەقامگیریی دەوڵەتی مەدینە لە جەنگەکانی بەدر و ئوحود و خەندەقدا، پێغەمبەری ئیسلام دەستی کرد بە گەیاندنی پەیام و بانگەوازەکەی بە ناوچەکانی تری نیوە دوورگەی عەرەبی. لە پەیمانی (حودەیبیە) بەدواوە جارێکی تر خەڵکی شاری مەدینە و هۆزەکانی تری

ناوچەکە تا دەگاتە دەوروبەری شاری مەککە، هەمووی پێکەوە بەکارهێنا وەك توێژی گۆڕین بۆ ڕزگارکردنی شاری مەککە و ناوچەکانی تری حیجاز بە گشتی. دوای ئازادکردنی شاری مەککە بە شێوازێکی ئاشتییانە، لێبوردنێکی گشتی و ڕەهای دەرکرد بۆ هەموو لایەك و ڕایگەیاند کە (اذهبوا فأنتم الطلقاء) کە بە درێژایی زەمان دەنگدەداتەوە و لە ماوەیەکی کەمدا توانیی شاری (طائف)یش کۆنترۆڵ بکات و ماڵ و سامانێکی زۆر و بێشوماری دابەش کرد بەسەر هۆزە عەرەبەکان و سەرەك هۆزەکاندا، بۆئەوەی بە تەواوەتی دڵنیایان بکاتەوە و مامەڵەی ئیجابی و دۆستانە بکەن لەگەڵ قۆناغە نوێیەکەدا و ناچار نەبن ڕێگای دوژمنکاری بگرنەبەر و مەترسی دروستبکەن لەسەر قەوارە و ئاسایشی ئەم دەوڵەتە نوێیە. دیسان بۆئەوەی بە سوودوەرگرتن لە توانا و لێهاتنی هەموو لایەك وەك توێژی بنیاتنان، هەموو بەشداریی کارا بکەن لە دابینکردنی سەقامگیری و دوورخستنەوەی هەڕەشە دەرەکییەکان و سەرخستنی پەیامی ئیسلامەتی و گەیاندنی بە ناوچەکانی تری دەرەوەی نیوە دورگەی عەرەبی، وەك پەیامێکی جیهانی.

## گرنگیی توێژە زێڕینەکە

توێژی گۆڕین، کە ئەرکی سەرخستنی هەر بزاڤ و پرۆژەیەکی چاکسازی و گۆڕانسازیی دەکەوێتە سەرشان، دیارە کە لە ئەزموونێکەوە بۆ ئەزموونێکی تر، یان لە قۆناغێکی مێژووییەوە بۆ قۆناغێکی تر، دەکرێ گۆڕان بەسەر سروشت و پێکهاتەیدا بێت. بەڵام گرنگ ئەوەیە کە ڕێبەرانی بزاڤەکە ڕانەوەستن و بە پەرۆشەوە بەبێ لەدەستدانی کات و دەرفەت، بگەڕێن بە دوای ئەو توێژەدا، کە

زۆرجار پێی دەوترێت ((توێژە زێرینەکە–الشریحة الذهبية)[٩] بۆئەوەی بتوانن لە دەرفەتی گونجاودا سەرکەوتن بەدەستبهێنن.

بۆ نموونە، لە شۆڕشی کۆمۆنیستیی ڕووسیا لە ساڵی١٩١٧دا، بە سەرکردایەتی (لینین)، توێژی گۆڕین بریتی بوو لە چینی کرێکاران، بەڵام لە شۆڕشەکەی چیندا بە سەرکردایەتی (ماوتسی تۆنگ) لە ساڵی ١٩٤٩دا، بریتی بوو لە چینی جوتیاران. هەروەك لە شۆڕشەکەی گەلی (صربيا) دژ بە ڕژێمی (میلۆسوفیج)ی دیکتاتۆر، توێژی گۆڕین بریتیبوو لە توێژی قوتابیان.

لەم سەردەمەداو لە سەرجەم وڵاتانی جیهاندا، بە تایبەتی وڵاتانی جیهانی سێیەم، توێژی قوتابیان گەورەترین توێژی کۆمەڵگە پێکدەهێنن و بەردەوامیش لە زیادبووندایە، بە تایبەتی قوتابیانی قۆناغی زانکۆ و پەیمانگاکان، بۆیە دەکرێ بزاڤەکانی چاکسازی و گۆڕانسازی پشت بەم توێژە ببەستن وەك توێژی گۆڕین، بۆ سەرخستنی پرۆژەی چاکسازی و گۆڕانسازی لە کۆمەڵگە هاوچەرخەکاندا.

هەر بزاڤێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی کە خاوەنی پرۆژەی چاکسازی و گۆڕانسازیی ڕاستەقینە بێت و بیەوێت بیگەیەنێتە ئەنجام، پێویستە هەرسێ توێژی (دەستپێك و گۆڕین و بیناکردن)ی هەبێ. بەبێ هەرسێ توێژەکە بە تایبەتمەندییەکانی خۆیانەوە و دروستبوونیان لە هەلومەرج و کاتی گونجاودا، سەرکەوتنی پرۆژەی چاکسازی و گۆڕانسازیی ڕیشەیی، سەرناکەوێت. دیارە کە هەرکام لەو سێ توێژە ڕۆڵ و کاریگەرێتی و تایبەتمەندێتی و کاتی گونجاو و پێویستی خۆی هەیە.

پەیداکردن و ئامادەکردنی توێژی یەکەم (توێژی دەستپێك) تا ڕاددەیەکی زۆر ئاسانە، چونکە لە هەموو هەلومەرج و بارودۆخێکدا کەسانێك هەن کە نیگەرانی و بێزارییان هەبێ لە واقیعەکە و ئامادەییان هەبێ بۆ هەڵسان بە ئەرك و

---

٩ یاسر الغرباوي، المصدر السابق، ص٤٧.

کارێك لە پێناو قەناعەت و بیر و باوەڕەکەیاندا، بەڵام دیارە ئەم توێژە خۆی بە تەنها کاری گەورەی پێ ناکرێت. بۆیە گرنگ پەیداکردن و گەیشتنە بە توێژی گۆڕین، ئەو توێژەی کە دەتوانێت پرۆژە و بەرنامەی بزاڤە سیاسییەکە بگوازێتەوە لە چوارچێوەی ڕێکخستن و ڕەوتێکەوە بۆ بزاڤێکی جەماوەریی گەورە و بەئەنجام گەیاندنی گۆڕانکاریی ڕاستەقینە و ڕیشەیی لە سیستەمی سیاسی و ئابووریی وڵاتدا.

ئیتر ئەو گۆڕین و گواستنەوەیە لە ڕێگای شێوازە یاسایی و دەستوورییەکانەوە بێت، وەك هەڵبژارنە گشتییەکان، بەوشێوەیەی کە لە سایەی سیستەمە دیموکراسییەکاندا ڕوودەدات، یان لە ڕێگای شێوازەکانی سەروو دەستوورییەوە بێت، وەك: یاخیبوونی مەدەنی و مانگرتنی سەرتاسەری بە مەبەستی دروستکردنی فشاری گەورە و کاریگەر لەسەر دەسەڵاتی سیاسی بۆ ملدان بە خواستەکانی جەماوەر، یان تەنانەت پەنابردن بۆ شۆڕش و ڕاپەڕینی جەماوەری.

توێژی گۆڕین بۆ ئەوەی بتوانێت کێشەکە یەکلابکاتەوە، جاری وا هەیە لە چەندین توێژ و چینی کۆمەڵگە پێکدێت. لە هەندێ لە کۆمەڵگەکاندا و لە هەندێ شۆڕش و ڕاپەڕیندا، زیاتر لە یەکێك لە توێژە سەرەکی و گەورەکانی کۆمەڵگە پێکدێت، وەك چینی کرێکاران یان جوتیاران یاخود قوتابیان. بەڵام هەتا ژمارەی ئەو توێژ و چینە کۆمەڵایەتییانەی کە توێژی گۆڕین پێکدەهێنن، زۆرتر بن، ئەوا دەرفەتی سەرکەوتنی بزاڤەکە مسۆگەرتر دەبێت، تا ئەو بزاڤانەی کە تەنها پشت بە یەکێك لە توێژەکانی کۆمەڵگە دەبەستن. بۆیە پێویستە لەسەر ڕێبەرانی بزاڤی چاکسازی و گۆڕانسازی، کە شارەزایی و زانیاریی تەواویان هەبێ لەبارەی سروشت و پێکهاتە و توانای هەرکام لە توێژ و چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگەکانی خۆیانەوە، بۆئەوەی بتوانن لە کات و هەلومەرجی پێویست و گونجاودا بەکاریان بهێنن و بەشدارییان بکەن لە پرۆسەی گۆڕیندا.

دەستنیشانکردنی توێژی گونجاو و پێویست بۆ هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی پرۆسەی چاکسازی و گۆڕانسازیی زۆرگرنگە، چونکە هۆکاری سەرنەکەوتنی زۆربەی ئەزموونە شکستخواردووەکان دەگەڕێتەوە بۆ تێکەڵکردن لە نێوان ئەو توێژانەدا و نەبوونی زانیاری و شارەزایی دروست لەبارەی یاسای چۆنێتی هەڵبژاردنی هەرکام لەوتوێژانە. ئاشکراشە کە ئەو بزاڤە سیاسییەی ڕەچاوی ئەم یاسایە نەکات[10] ، بەدڵنیایی سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت و ئاڕاستەی حەرەکەتی خۆی لێ تێکدەچێت و لە چوارچێوەی بازنەیەکی سنووورداردا زیاتر بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە، بەبێ ئەوەی بتوانێت کاری گەورە و یەکلاکەرەوە ئەنجام بدات. بۆیە پێویستە لەسەر هەربزاڤێکی چاکسازیخواز و گۆڕانخواز، بە تایبەتی بزاڤە ئیسلامییەکان، کە بە جیددی بگەڕێن لە شوێن ئەو توێژ و کەسانەی کە لە توانایاندایە گواستنەوەیەکی نەوعی و کاریگەر بۆ بزاڤەکە بەدەستبهێنن.

## ڕۆڵی پەروەردە لە پرۆسەی گۆڕین و چاکسازییدا

بە گەڕانەوە بۆ ڕێبازی ڕێبەرانی بزاڤەکانی چاکسازی و گۆڕانسازی لە کۆن و نوێدا، بە تایبەتی وردبوونەوەی باشتر لە ڕێبازی پێغەمبەری ئیسلام، هەر لە ساڵانی سەرەتای بانگەوازی ئیسلامی و دواتریش لە قۆناغە جیاجیاکانی حەرەکەتی بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلامدا، سەیر دەکەین لە هەندێ وێستگەدا وێڕای هاوپەیمانێتی کردن لەگەڵ هەندێ هۆز و خێڵی بەهێزدا، هەوڵی داوە تەنانەت سوود لە هەندێ کەسایەتیی کاریگەر وەربگرێت بۆئەوەی گوڕ و تینێك بدات بە پرۆژەکەی بۆ پێشەوە. بۆ نموونە لە ساڵانی سەرەتای دەستپێکی بانگەوازەکەیەوە سوودی گەورەی بینی لە موسڵمانبوونی هەریەك لە عومەری کوڕی خەتتاب و حەمزەی کوڕی عەبدولموتەڵیبی مامی، کە هەریەك لەو دوو

---

[10] د. جاسم سلطان، قوانين النهضة، المصدر السابق، ص٦٥.

کەسایەتییە مەزنە، توانییان بازدانێکی گەورە ببەخشن بە بانگەوازی ئیسلامی و لە قۆناغی نهێنییەوە بیگوازنەوە بۆ قۆناغی ڕاگەیاندن و ئاشکرا کردن. ئیتر بەبێ ئەوەی خۆی خەریك بکات بە هەندێ مەسەلەی لاوەکییەوە کە ئاخۆ چەند ساڵ لە کۆبوونەوەکانی (دار الأرقم)دا پەروەردەی وەرگرتووە و قورئانی لەبەرکردووە یان نا و بە چەند جۆرە تاقیکردنەوەدا تێپەڕی کردووە، بەڵکو پشتی بەستووە بە ڕاستییەکی نەگۆڕ لە بارەی مرۆڤ و پێکهاتەی کۆمەڵگەکانەوە کە (الناس كالمعادن خيارهم في الجاهلية خيارهم في الاسلام).

لە دوای کۆچکردنیشی بۆ شاری مەدینە، لەسەر هەمان ڕێباز بەردەوام بوو، ئەوەتا لە گەرمەی شەڕی خەندەق و گەمارۆدانی شاری مەدینەدا، کەسایەتییەکی وەك (نەعیمی کوڕی مەسعود) هاتە لای و ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ موسڵمان بوون، بەڵام پێغەمبەری مەزن (دروودی خوای لەسەر بێت) پێی وت تۆ تەنها کەسێکی و لە ئێستادا شتێکی گرنگ بۆ ئێمە زیاد ناکەیت، بۆیە باش وایە خۆت ئاشکرا نەکەیت و بڕۆیت بە سوودوەرگرتن لە ئاشنایەتی و دۆستایەتیت لای هاوپەیمانەکانی قورەیش، هەوڵ بدە کار بکەیت لەسەر هەڵوەشانەوەی هاوپەیمانێتییەکەیان. ئەویش ڕۆیشت و لەو بوارەدا کاری گرنگ و چارەنووسسازی ئەنجامدا. ئیتر بەبێ ئەوەی ئەو پیاوە وانەی پەروەردەیی و کار و ئەرکی حیزبی و تەنزیمیی وەرگرتبێت، سەیربکە ئەرك و کارێکی زۆر گرنگ و قیادیی پێ دەسپێرێت و بە چاکیش ئەنجامی دەدات.

هەر بە هەمان شێوە لە دوای بەستنی (صوڵحی حودەیبیە) سوودی گەورەی وەرگرت لە توانا و لێهاتنی کەسانی وەك (خالیدی کوڕی وەلید)، ئەوەبوو دوای سێ چوار مانگ بەسەر موسڵمانبوونیدا، ئەرکی فەرماندەیی لەشکری (مۆتە) یان پێ سپارد و پێغەمبەریش نازناوی (سيف الله المسلول)ی پێ بەخشی. بە چاو خشاندنێك بە لاپەڕەکانی ژیاننامەی پێغەمبەری ئیسلامدا، ڕێمان لە دەیان نموونەی لەم بابەتە دەکەوێت.

ڕاسته كه پرۆسەی پەروەردەكردن گرنگ و پێویسته، بەڵام ناكرێ بۆ هەموو كەسێك و له هەموو قۆناغەكاندا، هەر هەمان بەرنامه و هەمان شێواز بەكاربهێنرێت. چونكه له هەموو حاڵەتێكدا پرۆسەی پەروەردەیی ئامانج نییه، بەڵكو هۆكار و ئامرازێكه بۆ گەشەپێدانی لایەنی ئاینی و ئەخلاقی و ڕۆشنبیریی تاكەكان و ئامادەكردنیان بۆ ئەنجامدانی كاری دروست و پێویست. دیاره كه ئامادەیی كەسەكان و خێزان و بنەماڵەكان له ژینگه و هەلومەرجه جیاجیاكاندا دەگۆڕێت و مەرج نییه به هەمان شێوه و شێواز مامەڵه لەگەڵ هەموو كەسێكدا بكرێت.

توێژینەوه زانستییه هاوچەرخەكان لەبارەی دەروونزانییەوه، سەلماندوویانه كه هەندەسەی[11] دەروونی مرۆڤەكان چەند خەسڵەتێكی نەگۆڕ و گۆڕاو دیاری دەكەن. بەرنامەكانی پەروەردەیی تەنها دەتوانن كاریگەری لەسەر خەسڵەته گۆڕاوەكان درووستبكەن، بەڵام خەسڵەته نەگۆڕەكان ناكەونه ژێر كاریگەرێتیی بەرنامەكانی پەروەردەكردن. هەروەك چالاكییه وەرزشییەكان كه ناتوانن سیفەته نەگۆڕەكانی جەستەی مرۆڤ وەك كورتی و درێژی، یان ڕەش پێستی و سپی پێستی، بگۆڕن، بەڵكو تەنها كاریگەرییان لەسەر كێشی لەش و بەهێزكردنی ماسولكەكان و ئێسك به شێوەیەكی سنووردار دەبێت. به هەمان شێوەش ئاین و ڕۆشنبیری و ژینگەی كۆمەڵایەتی، ناتوانن پێناسی كەسایەتیی مرۆڤ بگۆڕن كه سیفەته نەگۆڕەكانی دیاری دەكەن.

بۆیه جێی خۆیەتی كه بزاڤه ئیسلامییەكان خوێندنەوەی قووڵتر و وردتر بكەن بۆ بەرنامەی پەروەردەیی پێغەمبەری ئیسلام (دروودی خوای لەسەر بێت) به سوودوەرگرتن له بەرهەمەكانی توێژینەوه زانستییه هاوچەرخەكان له بواری

---

[11] د. محمد عياش الكبيسي، أنماط الشخصية واشكالات القيادة والتربية في العمل الاسلامي، دار أسامة للنشر، عمان، الاردن، ط١، ٢٠١٠، ص١١، ص٢٦.

دەروونزانیدا و پێداچوونەوەی جیددی بکەن لە بەرنامەکانی پەروەردەکردنی خۆیاندا. چونکە پەیوەندییەکی مەرجدار نییە لە نێوان ساڵانی دیاریکراو بۆ پەروەردەکردن لەگەڵ بەرهەم و توانا و لێهاتنی کەسەکان بۆ هەڵسان بە گێڕانی ڕۆڵی کاراو بەهێز لە پرۆسەی چاکسازی و گۆڕانسازیدا. زۆر وادەبێت کەسانێك هەن کە لە دەرەوەی بازنەی ڕێکخستنی بزاڤەکەدان، بەڵام خاوەنی ئاستێکی بەرزن لە بلیمەتی و لێهاتن و شارەزایی و بوێری و توانای داهێنان، ئامادەییان بۆ بەخشین و قوربانیدان زۆر زیاترە لە کەسانێك کە ساڵەهای ساڵە لە ناو پرۆسەی پەروەردەییدا کاریان لەسەر دەکرێت... بەبێ ئەوەی پێویستیان بە ساڵانێکی دوور و درێژ هەبووبێ بۆ دارشتنەوەی کەسایەتییان و پەروەردە بوون لە چوارچێوەی بازنە حیزبییەکاندا.

پرۆسەی چاکسازی و گۆڕانسازیی ڕاستەقینە پێویستی بە هەموو لایەك هەیە و گرنگە زەمینە ساز بکرێت بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە دەتوانن بە شێوەیەك لە شێوەکان بەشداری بکەن لە پرۆسەی گۆڕانسازیدا. ئەگینا پرۆسەی چاکسازی و گۆڕانسازی گیرۆدەی دەستی (نظریات)ی ناواقیعی و چوارچێوە حیزبییە تەسك و سنووردارەکان دەبێت و لە کاروان دوادەکەوێت و دووچاری شکست و پاشەکشە دەبێت. بە تایبەت لەم سەردەمەدا کە سەردەمی جیهانگیری و شۆڕشی مەعلوماتییە و هۆکارەکانی گەیاندن و پەیوەندییەکان و بەدەستهێنانی زانست و مەعریفە لە بەردەم هەموو کەسێکدا، بە تایبەتی نەوەی نوێ، کراوەیە و ناکرێ بە هەمان ڕێوشوێن و میکانیزمە تەقلیدی و بەسەرچووەکان، بەرنامەی پەروەردەیی جێبەجێ بکرێت و بەتەمابین گۆڕانکاریی گەورە و ڕیشەیی ئەنجام بدەین. بۆیە پێویست و گرنگە کە دەزگا و بەرنامەی پەروەردەی ئاینی و ئەخلاقی سەربەخۆ بێت و کراوە بێت لەسەر هەموو هاووڵاتیان. لە لایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی ڕێبەرانی بزاڤی چاکسازی و گۆڕانسازی تا ڕادەیەکی باش دەستیان واڵا و کراوە بێت بۆ چۆنێتی سوودوەرگرتنی لە وزە و لێهاتنی ئەندامانی کۆمەڵگە لە وێستگە و

کار و ئەرکە جیاجیاکاندا، لە هەمان کاتیشدا دەرفەت لە بەردەم هەموو لایەکدا کراوە بێت بۆئەوەی بتوانن بەشداری بکەن لە پرۆسەی چاکسازی و گۆڕانسازیدا و کۆسپ و لەمپەری ناواقیعی ڕێگایان لێ نەگرێت.

ئەوەش ڕاستە کە پەروەردەبوون و ئامادەیی و خۆسازدان بۆ سوودوەرگرتن و ڕۆڵبینین لە هەر دەرفەت و وێستگەیەکدا کە دێتە پێش، مەسەلەیەکی گرنگ و بنچینەییە، بەڵام ئەوە مەسەلەیەکی ڕێژەییە و پلەیەکی دیاریکراو و زانراوی نییە و بەستراوە بە چەندین هۆکاری ترەوە، وەك توانای بە خێرایی هاتنە دەست و سوودوەرگرتن لە چرکە ساتی مێژوویی و هەستیار، کە هۆکارێکی جەوهەری و چارەنووسسازە بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن و یەکلاییکردنەوەی کێشە و ململانێکان، چونکە دەرفەت و هەلومەرجی گونجاو زۆر ناخایەنێت کە لە دەست دەردەچێت. لە حاڵەتێکی ئاوادا ئەو لایەن و کەسانەی کە بەردەوام لە دڵەڕاوکێدان و ناتوانن لە وێستگە هەستیارەکاندا دەستوبرد بکەن و بە خێرایی بێنە دەست، ئەگەرچی ئامادەکاریی باشیشیان هەبێت و ساڵانێکی دوور و درێژیش بەرنامەی پەروەردەیی هەمەلایەنەیان جێبەجێ کردبێت، بەڵام دەگونجێ لایەن و گرووپی بچووکتر و تازەتر بتوانن دەرفەتەکان چاکتر بقۆزنەوە، یان بەلای کەم لەو بزاڤ و کۆمەڵانەی تێك بدەن کە ساڵانێکە لە ئامادەکاریدان و چاوەڕێی هەل و دەرفەتێکی گونجاو دەکەن.

## شێوازەکانی ڕێبازی گۆڕین و چاکسازی

شێوازەکانی ڕێباز و مەنهەجیەتی چاکسازی و گۆڕانسازی دەکرێ لە دوو شێوازی سەرەکیدا کورت بکەینەوە:

یەکێکیان ڕێبازی پلەبەندیی لەسەرخۆ، کە شێوەیەکی کەڵەکەبوون (التراكمي) وەردەگرێت و لە دوورمەودادا دەبێتە هۆی ڕوودانی گۆڕانکاریی ڕیشەیی و گەورە

لە بیر و هۆشیاری و ڕۆشنبیری و لایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سەرجەم بوارەکانی تری ژیانی کۆمەڵگەکاندا، سەرەنجام بە گۆڕانکاریی گەورە لە سیستمی سیاسی و ئابووری و هەمەلایەنەدا کۆتایی دێت.

یان ئەوەتا ڕێبازێکی کورتکراوە دەبێت بە شێوەیەکی ڕێژەیی لە ڕووی کات و قۆناغەکانی گەیشتن بە ئامانج، وەك زۆرێك لە شۆڕشە گەورەکانی جیهان لە سەردەمە جیاوازەکاندا، کە توانیوانە لە ساڵانێکی سنووردراردا سەرکەوتن بەدەست بهێنن و گۆڕانکاریی ڕیشەیی و گەورە لە سیستمی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیدا ئەنجام بدەن. وەك شۆڕشی بەلشەفی لە ڕوسیا لە ساڵی ١٩١٧دا و شۆڕشی کۆمۆنیستی چین لە ١٩٤٩دا و شۆڕشی ئیسلامیی ئێران لە ساڵی ١٩٧٩دا و چەندین شۆڕشی تر و نموونەی تر لە کۆن و نوێدا.

بەڵام ئاشکرایە باشترین نموونە و مۆدێل کە شیاوی ئەوە بێت لە لایەن بزاڤە ئیسلامییەکانەوە لە هەموو سەردەمێکدا بکرێتە پێشەنگ و سەرمەشق، بریتییە لەو ڕێباز و مەنهەجیەتەی کە پێغەمبەری ئیسلام (دروودی خوای لەسەر بێت) لەسەری ڕۆیشتووە، کە توانی لە ماوەی (٢٣) ساڵی پێغەمبەرێتیی خۆیدا پەیامەکەی لە چوارچێوەی پرۆژەیەکی فیکری و سیاسی و کۆمەڵایەتیدا، گۆڕانکاری و چاکسازیی ڕیشەیی لە نیوە دورگەی عەرەبیدا ئەنجام بدات و بوو بە سەرەتایەکی مەحکەم و مێژوویی بۆ ڕوودانی گۆڕانکاریی گەورە لە سیستمی جیهانی و نێودەوڵەتیی ئەو ڕۆژگارەدا و شارستانێتیی ئیسلامی لێ هاتە کایەوە، کە بۆ چەند سەدە ڕێبەرایەتی جیهانی کرد.

لە ڕاستیدا دەبوایە: (ڕێباز و مەنهەجیەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە زانکۆ و کۆلێژەکانی زانستە سیاسییەکاندا بخوێنرایە، چونکە نموونەیەکی سەرسوڕهێنەر و کەموێنەیە بۆ سەرکەوتنی پرۆژەیەکی چاکسازی و گۆڕانسازیی ڕاستەقینە، کە هەموو شێوازەکانی ململانێی تێدا بەکارهێنراوە لە تاکتیك و ستراتیژ و هونەری ئیدارەدانی کێشە و مانۆڕی جیاجیا، بەبێ دەستهەڵگرتن لە

پابەندبوون بە بەها و بنەماکان. هەروەها چۆنێتیی گواستنەوە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر لە شێوازی کاری ئاشتییانە و دوور لە هەر جۆرە توندوتیژییەك، لە هەمانکاتدا گواستنەوە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر لە شێوازی کاری سەربازی و بەکارهێنانی هێز، پاشان گەڕانەوە بۆ شێوازی کاری سیاسیی ئاشتییانە، بەڵام لە ئاستێکی باڵاتر و پێشکەوتووترەوە).[١٢]

بێگومان یاسا و سوننەتە کۆمەڵایەتییەکانیش هەروەك یاسا سروشتییەکان، ئەو کەس و لایەن و کۆمەڵگانە سوودیان لێ وەردەگرن کە لێیان تێدەگەن و قەدریان دەزانن و ڕەچاویان دەکەن لە بزاوت و حەرەکەتی خۆیاندا. خۆ ئەگەر ئیسلامییەکان بە چاکی دەرکی ئەو یاسایانە نەکەن و بەکاریان نەهێنن، ئەوا دووجار زەرەرمەند دەبن: ((جارێك لە ڕووی ئاینییەوە بە گوناهباربوون و کەمتەرخەمی دەدرێتە قەڵەم، چونکە هیچ لە بەڵگە و ئایەتەکانی پەروەردگار فێرنەبوون کە فەرمانی پێداون بە تێڕامان و دەرککردن و کارپێکردنیان. جارێکی تریش لە ڕووی دنیاییەوە، کە خۆیان و وڵاتیان لە دەرفەتی چاکسازی و گۆڕانسازیی دروست و پێویست مەحروم دەبن)).[١٢]

ڕێباز و مەنهەجیەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە بنەڕەتدا مەنهەجیەتێکی گۆڕانسازیی ڕیشەییە، بەڵام هاوکات سوودیشی لە هۆکارەکانی ڕێبازی چاکسازی وەرگرتووە بە مەبەستی ڕێگا خۆشکردن بۆ گەیشتن بە گۆڕانسازیی ڕیشەیی. نهێنیی سەرکەوتن و بەرەو پێشچوونی بەردەوامی پێغەمبەری ئیسلام لەوەدایە کە خاوەنی دید و روئیایەکی ڕۆشن بووە و دوائامانجەکانی لەلا ڕۆشن بووە و لەسەر ئەو بنەمایە ستراتیژیەتی پێویست و گونجاوی دارشتووە و لە هەلومەرج و کاتی گونجاودا هەوڵی بەئەنجام گەیاندنی داوە. ئەگەر هەلومەرجەکە پێویستی بە ڕووبەڕووبوونەوە و قوربانیدان بووبێت،

---

[١٢] نفس المصدر، ص١٦.

ئەوا بەبێ دڵەڕاوکێ پلان و بەرنامەی بۆ داناوە و جێبەجێی کردووە.. خۆ ئەگەر هەلومەرجەکە پێویستی بە ئاشتی و صولْحکردن بووبێت، ئەوا بەبێ دوودڵی ئامادەیی دەربڕیوە و بەیاننامەی صولْح و ئاشتیی مۆرکردووەو بە تەواوەتی پابەندی ناوەڕۆکەکەی بووە. جەنگی بەدر و صولحی حودەیبیە و ئازادکردنی شاری مەککە، نموونەی ڕۆشن و حاشا هەڵنەگرن لەسەر ئەو ڕاستییە. بۆیە سەرکردایەتیی سیاسی پێویستە ئامادەسازیی هەبێت بۆ شەڕ و بۆ ئاشتی و بۆ هەرکامیان بتوانێت بەرنامە و پلان و هۆکارەکانی بەئەنجام گەیاندنی دەستەبەر بکات، ئەگەرنا سەرکردایەتییەکی شکست خواردوو دەبێت و لایەنگرانی و جەماوەرەکەی دووچاری نائومێدی و پاشەکشە و دواکەوتن دەکات.

پێویستە ڕەچاوی ئەوەش بکەین کە سوودوەرگرتن لە ڕێبازی پێغەمبەری ئیسلام (دروودی خوای لەسەر بێت) لە حاڵەتی سیستمە دیکتاتۆرییەکاندا یان لە حاڵەتی ئەو سیستمانەی کە بە شێوەیەك لە شێوەکان پەراوێزێکی دیموکراسیی هەیە و ڕێکارە دەستورییەکان ڕێگایان پێ دەدرێت، بۆ هەرکام لەو دووحاڵەتە بە شێوازی جیاواز سوودی لێ وەردەگیرێت. لە نێوان گرتنەبەری ڕێبازی گۆڕانسازیی ڕیشەیی لە حاڵەتی سیستمە دیکتاتۆرییەکاندا، ئەو سیستمانەش کە دیاردەی گەندەڵیی سیاسی و ئیداری و دارایی تێیاندا گەیشتووە بە ئەندازەیەك کە ئومێدی چاکسازی کردنیان لە چوارچێوەی ڕێکارە دەستوورییەکاندا ئەستەم دەبێت. دیارە لەو حاڵەتانەدا دەخوازێت سوود لە ڕێکارە سەروو دەستوورییەکانیش وەربگیرێت، وەك مانگرتنی گشتی و خۆپیشاندان و یاخیبوونی مەدەنیی سەرتاسەری، یان تەنانەت پەنابردن بۆ شۆڕش و ڕاپەڕینی جەماوەری، لە حاڵەتێکدا کە زۆرینەی زۆری چین و توێژەکانی گەل ئامادەبن بەشداریی تێدا بکەن.

# بەشی دووەم:
# هەڵسەنگاندنێك بۆ ڕۆڵ و ڕێبازی بزاڤە ئیسلامییەكان

## بزاڤە ئیسلامییەكان لە میسر و وڵاتانی ئیسلامی

ئێستا با لەو دیدگایەوە كە لە بەشی یەكەمدا توێژینەوەیەكی زانستییانەمان لەبارەیەوە پێشكەشكرد، خوێندنەوەیەك بكەین بۆ ڕێبازی بزاڤە ئیسلامییە هاوچەرخەكان لە ناوچەكەدا و پانۆرامایەكی خێرا و گشتگیر بخەینەڕوو سەبارەت بە ڕەوتی ڕووداوەكان و كاریگەرییان لە پرۆسەی چاكسازی و گۆڕانسازیدا و ئەو هەوراز و نشێویانەی ڕووی كردووەتە بزاڤە ئیسلامییەكان، لە نیوەی دووەمی سەدەی ڕابوردوو بەدواوە تا سەرهەڵدانی شۆڕش و ڕاپەڕینە جەماوەرییەكان لە وڵاتانی عەرەبیدا.

سەرەتا دیارە دەبێت لە بزاڤی برایانی موسڵمانەوە (الاخوان المسلمون) دەست پێ بكەین، چونكە گەورەترین و كاریگەرترینی هەموو بزاڤە ئیسلامییەكانە، كە هەر لە سەرەتاوە ((خوالێخۆشبوو شێخ حەسەن بەننا)) ڕێبازی بزاڤەكەی لە چوارچێوەی پرۆسەی چاكسازی و گۆڕانسازیدا بە شێوەیەك داڕشتووە كە پەشت دەبەستێت بە پەروەردەكردن و چاكسازیكردنی تاكی موسڵمان و خێزانی موسڵمان و كۆمەڵگەی موسڵمان و حكومەتی موسڵمان و...تا دەگاتە دامەزراندنی دەوڵەتی جیهانی خەلافەت و هەڵسان بە بەرپرسیارێتییە جیهانییەكانی تر. دیارە بەبێ پەنابردن بۆ شۆڕش و توندوتیژی و بەكارهێنانی هێز، بەڵكو بە شێوازی درێژەدان بە خەبات و ئەنجامدانی چالاكیی گونجاو و ڕێگا پێدراو لە چوارچێوەی دامەزراوە یاسایی و دەستوورییەكاندا.

بەڵام مەعلومی هەموولایەكە كە زۆربەی وڵاتە عەرەبییەكان، بە تایبەتی وڵاتی میسر كە مەڵبەندی سەرەكیی حەرەكەتی ئیخوانە، بە درێژایی سەدەی بیستەم تا

سەرهەڵدانی شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبی، بە تایبەتی دوای شەهیدکردنی ڕێبەری بزاڤەکە لە ساڵی ١٩٤٩دا و لە دوای شۆڕشی تەمووز/١٩٥٢وە کە گۆڕا بۆ سیستمی حوکمڕانی عەسکەرتار و داپڵۆسێنەر، هیچ بوارێك نەمایەوە بۆ خەباتی یاسایی و دەستووری و بەوهۆیەوە لایەنگرانی بزاڤەکە دووچاری دڕندەترین پرۆسەی لێدان و چەوساندنەوەبوون تا ئاستی ڕیشەکێشکردن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بزاڤی ئیخوان نەیتوانی یان نەیویست مەنهەجیەتێکی نوێ و ستراتیژێکی گونجاو لەگەڵ دۆخەکەدا بگرێتە بەر. هەر ئەوەش هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ پاشەکشەکردن و دواخستنی بەئەنجام گەیاندنی پرۆژەکەیان و پەرتەوازە بوون و دواکەوتنیان لە بەدەستهێنانی سەرکەوتن و گەیشتن بە ئامانج لە کاتێکی گونجاو و دیاریکراودا، بە بەراورد لەگەڵ ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجە و قوربانیدانەی کە ڕووبەڕوویان بوویەوە. تا حاڵ گەیشت بەوەی کە چەندین ئاراستەی فیکری و فیقهیی توندڕەویان لێ دروستبوو، کە بە داخەوە هەندێکیان پەنایان برد بۆ بەکارهێنانی شێوازی توندوتیژ و خوێناوی دژ بە ڕژێمەکان و دەزگا و دامەزراوە گشتییەکان. لەو میانەدا ڕوداوی کارەسات ئامێز ڕویدا و دەرەنجامەکەی گەیشت بە بەرپاکردنی جەنگی دژەتیرۆر لە لایەن ئەمریکا و ڕۆژئاواوە لەسەر ئاستی جیهان. سەرەنجام نەوەی نوێ لە وڵاتانی عەرەبیدا گەیشتن بەو قەناعەتەی کە هیچ ڕێگا چارەیەك لە ئاسۆدا بەدی ناکرێت، نە لە لایەن ڕژێمە دیکتاتۆر و گەندەڵەکانەوە و نە لە لایەن هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆنیشەوە، بە ئیسلامی و عەلمانییەکانەوە.

بێئومێد بوون لە چاکبوون و گۆڕانی ئەو واقیعە پڕ لە گەندەڵی و ناعەدالەتی و دیکتاتۆرییە گەیشتە ئاستێك کە لێرە و لەوێ کەسانێك، بە تایبەتی لە نەوەی نوێ و دەرچووانی زانکۆ، وەك (موحەممەد بوعەزیزی) لە تونس، پەنایان برد بۆ خۆسووتاندن وەك کاردانەوە و ڕەتکردنەوەی ئەو ژیان و گوزەرانە ناهەموارەی تێیدا دەژیان. ئەوە لە لایەك و لە لایەکی تریشەوە هوشیاربوونەوەی خەڵك بە تایبەتی گەنجان، لەژێر کاریگەریی شۆڕشی مەعلوماتی و تەکنۆلۆژیای گەیاندن و

ئاگادار بوون لە حاڵ و ژیانی وڵاتانی خۆشگوزەران و پێشکەوتوو... هەموو ئەو هۆکارانە بوونە هاندەر بۆئەوەی نەوەی نوێ هەموو لایەك تێپەڕێنن و بڕژێنە سەر شەقامەکان و هەموو جەماوەر و لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆنیش، بە تایبەتی لایەنە ئیسلامییەکان، بە دوای خۆیاندا ڕاکێشن، بۆ ڕیشەکێشکردنی ئەو بارودۆخە چەقبەستووە و ڕامالینی دەسەڵاتە دیکتاتۆرەکان. کە هەر ئەوەش بووە هۆی بەرپابوونی شۆڕش و ڕاپەڕینە جەماوەرییەکانی بەهاری عەرەبی لە تونس و میسر و چەند وڵاتێکی تری ناوچەکە بە شێوازی جیاجیا و تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت بەردەوامە.

دەگونجێ یەکێك لەو هۆکارانەی کە بەردەوام ڕۆڵی هەبووە لەوەدا کە بزاڤە ئیسلامییە ئیخوانییەکان بیرلەگۆڕینی ستراتیژ و ڕێبازی کاری خۆیان نەکەنەوە، بگەڕێتەوە بۆ ڕێسایەکی ئیسلامیی گشتی کە زۆرینەی زانایان و فەقیهە موسڵمانەکان لە کۆن و نوێدا، لەسەری کۆکن. ئەو ڕێسایەش ئەوەیە کە ناکۆکییە سیاسییەکان لە ناوخۆی کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا پێویستە بە ڕێگای ئاشتییانە چارەسەر بکرێت، بەبێ پەنابردن بۆ بەکارهێنانی هێز و توندوتیژی و بەرپابوونی پشێوی و پاشاگەردانی، کە لە فیقهی ئیسلامیدا بە (الفتنة) ناوزەد دەکرێت. ئەو فیقهە سیاسییە نادروستەی کە لە سەردەمی حوکمڕانێتی ئەمەوییەکان و پاشان عەباسییەکاندا، لەژێر کاریگەرێتیی ستەمکاریی سیاسیی خەلیفەکاندا گەڵاڵە بوو، گۆڕانی ڕیشەیی هێنا بەسەر ئەو گوتار و فیقهە سیاسییەی کە خەلیفەکانی ڕاشیدین بنەماکانیان بەرجەستە کرد و لەسەری دەڕۆشتن. چونکە لە هەموو حاڵەتێکدا پێویستە لەسەر کۆمەڵگە موسڵمانەکان بە سەرجەم چین و توێژەکانیانەوە، هەڵسن بە بەجێهێنانی بەرپرسیارێتی خۆیان و سنوورێك دابنێن بۆ دەسەڵاتداری ستەمکار و گەندەڵ و ناچاری بکەن بە وازهێنان یان دەست لەکار کێشانەوە.. نەك بێدەنگیی لێ بکرێت و درێژە بەو بارودۆخە ناهەموار و

نەخوازراوە بدرێت، بە پاساوی دروستنەبوونی پشێوی و ئاژاوە، کە تەنها دەسەڵاتداری ستەمکار لێی سوودمەند دەبێت.

دەکرێ یەکێکی تر لە هۆکارەکانی نەگۆڕینی ستراتیژ و ڕێبازی چاکسازی و ئاشتیخوازانەی بزاڤە ئیسلامییەکە، بگەڕێتەوە بۆ خۆلادان لە ڕووبەڕووبوونەوەی توند و لێدانی ڕیشەکێشکردن لە لایەن دەسەڵاتی ستەمکارەوە. بەڵام دیارە کە دەسەڵاتی ستەمکار جگە لە شێوازی ڕیشەکێشکردن دژ بە هێزە نەیارەکانی، شێوازێکی تر نازانێت و بڕوای بە ململانێی دەستووری و یاسایی نییە لە چوارچێوەی پرنسیپە دیموکراسییەکاندا، هەڵبژاردنە گشتییە پڕ لە ساختەکارییەکانیش بەڵگەیە لەسەر ئەم ڕاستییە. ئەگەرچی بە داخەوە، ئەو خۆلادانەش هیچ شەفاعەتێکی نەکرد، بە تایبەتی لە میسر و سوریا و تونس، ئەوەبوو دووچاری هەڵمەتی داپڵۆسین و ڕیشەکێشکردن بوون. درێژەدان بەو حاڵەتە و بیرنەکردنەوە لە داهێنانی ڕێباز و ستراتیژی نوێ و گونجاو لەگەڵ بارودۆخە چەقبەستووەکەدا، هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ پەرتەوازەبوون و سەرهەڵدانی چەندین باڵی توندڕەو، هەر لە جەماعەتی (تەکفیر و هیجرە)وە بگرە تادەگاتە ڕێکخراوی (قاعیدە)، وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد. تەنانەت لەو وڵاتانەشدا کە بە شێوەیەکی سنووردار بواری کارکردنیان هەبووە لە هەردوو بواری دەعوە و سیاسەتیشدا، وەك کوەیت و ئەردەن و جەزائیر... لەو وڵاتانەشدا نەیانتوانی ببنە هێزێکی سیاسیی جەماوەریی وەها کە گۆڕانکاریی گەورە یان بە لای کەمەوە چاکسازیی ڕاستەقینە لە سیستمی سیاسیی ئەو وڵاتانەدا بهێننە کایەوە، پێش ڕاپەڕینەکانی بەهاری عەرەبی. ئەزموونی بەشداریکردنی بزاڤە ئیسلامییەکان لە حکومەتەکانی ئەو وڵاتانەشدا لە دەرەنجامدا بە زەرەر بۆ سەر بزاڤە ئیسلامییەکان شکایەوە.

بەڵام لە سودان کە ڕێباز و ستراتیژی نوێیان گرتەبەر، توانییان سەرکەوتن بەدەستبهێنن و حوکمی وڵات بگرنە دەست. ئەگەرچی ڕەخنە و تێبینیی زۆریش

لەسەر ئەزموونەکەیان هەیە، بەڵام سەرکەوتن هەمیشە ڕێژەییە و بێ کەموکورتی نابێت و زۆر لەوە باشتر بوو کە بە هەمان شێوەی میسر درێژەیان بدایە بە حاڵەتی پەراوێزبوونی خۆیان.

بزاڤی ئیسلامی لە ئێران بە تایبەتمەندێتییەکانی خۆیەوە، ئەوەبوو یەکەم جار لەساڵی١٩٦٣ دەستیانکرد بە دەربڕینی دژایەتییان بۆ سیاسەتی بە ڕۆژئاوایی کردنی ئێران و لەساڵی ١٩٧٨دا دەستیان دایە خۆپیشاندانی جەماوەری و سەرەنجام پەرەی سەند و گۆڕا بۆ ڕاپەڕین و شۆڕشێکی جەماوەری کە زۆرینەی زۆری خەڵکی ئێران بەشدارییان تێدا کرد، توانییان لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٩ بە تەواوی ڕژێمی شاهەنشاهی بڕووخێنن و کۆماری ئیسلامی دابمەزرێنن.

ئەگەر لە لایەکی ترەوە بۆ مەسەلەکە، بڕوانین ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە هەبوونی ململانێ و کێشمەکێش لەناو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا لە حاڵەتی ئاشتیدا بێت یان لە حاڵەتی جەنگدا، یاسایەکی بەردەوام و سوننەتێکی خواییە لە ژیان و بوونەوەردا. ڕەوتی ژیان و پێشکەوتنی بەستراوە بە چۆنێتیی ئیدارەدانی کێشە و ململانێکانەوە، قورئانی پیرۆزیش زۆر بە ڕوونی جەختی لەسەر دەکاتەوە کە دەڵێت: (وَلَوْلاَ دَفْعُ اللّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ الأَرْضُ وَلَـكِنَّ اللّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ) (البقرة: ٢٥١).

بۆیە موسڵمانان و لایەنە ئیسلامییەکان بە شێوەیەکی گشتی، نابێت بە هیچ شێوەیەك تەسلیم بە واقیعە نەخوازراوەکە ببن و نابێت کۆڵ بدەن لە گەڕان بە دوای ڕێگای تر و دەروازەی تردا بۆ دەرچوون لە قەیران و گەیشتن بە سەرکەوتن و ئامانج. ئەوەتا پێغەمبەری مەزن (درووود و سەلامی خوای لێبێت) هەرکاتێك دەرگایەك لە بەردەمیدا دابخرایە هەوڵی دەدا دەرگای تر و ڕێگای تر لە خۆی بکاتەوە. جارێك موسڵمانانی دەنارد بۆ وڵاتی حەبەشە و چەندین جار پەیوەندیی دەکرد بە هۆز و خێڵە عەرەبەکانی نیوەدورگەی عەرەبییەوە، تا دواجار ڕێی کەوت لە گرووپێك لە خەڵکی شاری مەدینە لە وەرزی حەجدا و لە ڕێگایانەوە

دەستی گەیشت بە هۆکارێکی زێڕین و دەرفەتێکی زێڕین لەو هەلومەرجە نەخوازراو داخراوەی کە لە شاری مەککە ڕەوبەڕوەی بووبووەوە. ئەوەبوو پرۆسەی کۆچکردن بۆ شاری مەدینە دەستی پێکرد و دەروازەیەکی فراوانی بۆ سەرکەوتنی بانگەوازەکەی بەدەستهێنا.

کەواتە ململانێ و کێبڕکێ یاسایەکی نەگۆڕە لە ژیان و بوونەوەردا و جەوهەر و نهێنیی مانەوەی مرۆڤە لەم سەرزەوییەدا. چونکە ژیانی کۆمەڵگەکان هەردەم پێویستی بە ئاشتی و ئاسایش و ئاوەدانکردنەوەیە، بەڵام بەشێك لە مرۆڤەکان بەردەوام زیادەڕەوی دەکەن بەسەر ئەوانی تردا، لە ئاکامی فرەیی ئینتیماءات و جیاوازیی بیر و بۆچوون و تێڕوانینی جیاواز بۆ چۆنێتیی دەستەبەرکردنی بەرژەوەندییەکان، ئەو بەرژەوەندییانە ئاینی بن، یاخود دنیایی. دیارە ئەو جیاوازی و جیاکارییە دەبێتە هۆکاری بەردەوامبوونی پرۆسەی ململانێ و ڕووبەڕووبوونەوە، هەتا ژیان لەسەر ئەم زەوییە بەردەوام بێت، ئەو حاڵەتەش هەرگیز کۆتایی پێ نایەت.

دیارە کێشمەکێش و ململلانێ بە شێوازی جیاجیا ڕووبەڕووی هەر ڕێکخراو و بزاڤ و سیستمێکی سیاسی دەبێتەوە، لە قۆناغە جیاجیاکانی هەر حەرەکەت و ڕەوتێکدا. هەر بزاڤ و سیستمێکی سیاسیش بە شێوەیەکی گشتی لە سێ قۆناغی یەك لە دوای یەکدا دووچاری مەترسیی ململانێ و کێشمەکێش دەبێت، بەم شێوەی خوارەوە:(١٣)

**قۆناغی یەکەم:** پاراستنی بوون و مانەوەیە، چونکە هەر بزاڤ و سیستمێك، بەڵکو هەر بوونەوەرێك، پێش هەموو شتێك لە هەوڵی پاراستنی بوون و درێژە دانە بە مانەوەی خۆی، لە هەر مەترسییەك ڕووی تێ بکات.

---

[١٣] د. جاسم سلطان، قوانين النهضة، المصدر السابق، ص١٤٩.

**قۆناغی دووەم:** کە قۆناغی سەقامگیربوونە، واتە هەر بزاڤ و سیستمێك دوای ئەوەی بوون و مانەوەی خۆی مسۆگەر کرد، کار دەکات بۆ دابینکردنی ئاسایش و سەقامگیریی خۆی و دوورخستنەوەی ئەو مەترسییانەی ڕوودەکەنە ئاسایش و سەقامگیری.

**قۆناغی سێیەم:** کە قۆناغی بنیاتنان و گەشەپێدان و بەرەوپێش چوونە، دیارە کە لە دوای دەرباز بوون لە مەترسییەکانی هەردوو قۆناغەکەی پێشتر، دێتە کایەوە.

بۆیە ئەرکێکی سەرەکی و بنەڕەتیی ڕێبەرانی هەر بزاڤێکی سیاسی و کۆمەڵایەتییە، پێش هەموو شتێك خوێندنەوە و تێگەیشتنی ورد و دروستیان هەبێ لەبارەی سروشت و پێکهاتەی کۆمەڵگە و سیستمی سیاسیی وڵاتەکەیان، بۆئەوەی بزانن بە چ شێوە و شێوازێك ڕێبازی کار و حەرەکەتی بزاڤەکەیان دیاری دەکەن و چ جۆرە ستراتیژ و تاکتیکێك دەگرنەبەر، بۆ سەرخستنی پرۆژەکەیان و گەیشتن بە ئامانج.

لەم بوارەدا بزاڤی ئیسلامی لە تورکیا کە خوا لێ خۆشبوو (شێخ سەعید نورسی) ڕێبەر و دامەزرێنەریەتی، زۆر زوو دەرکی کرد بە سروشت و پێکهاتەی تورکیای دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی بە ڕێبەرایەتی ئەتاتورك و هاوکارەکانی. لەگەڵ ئەو هەموو کۆسپ و تەگەرە و سنووردارکردنانەی کە ڕژێمی ئەتاتورکی خستیە سەر ئیسلام و ئیسلامیخوازان، بەڵام (شێخ سەعید نورسی) و قوتابییەکانی لە دوای خۆی، ڕێباز و مەنهەجیەتێکیان گرتەبەر بەپێی ستراتیژیەتێکی گونجاو لەگەڵ هەلومەرجە نوێیەکەدا لەژێر ناوی ڕزگارکردنی ئیمان و پاراستنی ئیسلامەتیی خەڵکی موسڵمانی ئەو وڵاتە. دواتریش شاگردان و قوتابییەکانی توانییان بیخەنە چوارچێوەی کاری دەزگاییەوە، بەوشێوەیەی کە (شێخ فەتحوڵڵا گولەن) لە نامەیەکدا بۆ کۆنگرەیەك کە لە لایەن جامیعەی وڵاتانی عەرەبییەوە، لە مانگی ئۆکتۆبەری/٢٠٠٩ لە قاهیرە بەستراوە، ناوەرۆکی

ڕێبازەکەیان دەخاتەڕوو، کە بریتییە لە پرۆسەی فێرکردن و پەروەردەکردن و خزمەتی ئیمانی بە شێوەیەکی هاوچەرخ. وەك بزاڤێکی کەڵەکەکردنی درێژخایەن، توانییان گۆڕانکاریی ڕیشەیی لە کۆمەڵگەی تورکیادا ئەنجام بدەن.

شێخ فەتحوڵڵا گولەن لە بەشێکی ئەو نامەیەدا دەڵێت: (پەروەردە و فێرکردن بە گشت ڕەهەندەکانیەوە، بریتییە لە جەوهەر و ناوەڕۆکی مەنهەجیەتی ئیصلاحی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە... نهێنیی ناوەندێتیی پەروەردە و فێرکردن لە کاری ئیصلاحیدا ئەوەیە کە بە دەوری مرۆڤدا دەخولێتەوە.. کەواتە چاکسازیی نەوەکان پەیوەستە بە چاکسازیی پەروەردە و فێرکردنەوە کە بریتییە لە بیناکردنەوەی مرۆڤ بە گشت ڕەهەندە دەروونی و فیکرییەکانیەوە.. فێرکردن و پەروەردەکردن بەپێی مەنهەجی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێت) لە توانایدایە ژێرخانە ئابووری و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەتی و سیاسی و ڕۆشنبیرییەکانی وڵات، نوێ بکاتەوە..)).[١٤]

هەر ئەو مەنهەجیەتە درێژ خایەنەش بوو کە زەمینەی خۆشکرد بۆ سەرهەڵدانی بزاڤێکی سیاسیی پاشخان ئیسلامی لە سایەی سیستمی دیموکراسی و فرەلایەنیی وڵاتەکەدا، کە ئێستا وەك باشترین نموونەی کاری سیاسیی ئیسلامی لە هەموو جیهاندا دەنگی داوەتەوە، بە تایبەتی لە بوارەکانی چاکسازیی سیاسی و بنەبڕکردنی گەندەڵی و گەشەپێدانی ئابووریدا.

ئێستا دوای سەرکەوتنی شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبی و هاتنە پێشەوەی بزاڤە ئیسلامییەکان، بە تایبەتی کۆمەڵی ئیخوان لەو وڵاتانەدا، کە لە ڕاستیدا هێشتا ناکرێ بە ئاسانی بە سەرکەوتنی پرۆژەی سیاسیی ئەوان لە قەڵەم بدرێت، چونکە ئەوە جەماوەر بە گشتی و نەوەی نوێ بوون بە تایبەتی، دوای بێ ئومێد

١٤ ملحق خاص لمجلة الحراء، تقرير حول مستقبل الاصلاح في العالم الاسلامى، خبرات مقارنة مع حركة فتح الله كولن التركية، جامعة الدول العربية- القاهرة، ١٩-٢١ اكتوبر، ٢٠٠٩، ص٢١-٢٢.

بوونیان له هەر یەك له دەسەڵات و لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆن، به ئیخوانیشەوە، هەڵسان به ڕاپەڕین و شۆڕش دژ به دەسەڵاته دیکتاتۆرەکان و ڕێگا کرایەوە له بەردەم هەموو لایەکدا، به تایبەتی بزاڤه ئیسلامییەکان، که به هەموو توانا و قورساییەك که ساڵەهای ساڵه کاری لەسەر دەکەن، هاتنه ناوجەرگەی ڕووداوەکان و ئێستا ڕۆڵی خۆیان دەبینن له بنیاتنانەوەی وڵاتدا، دوای ڕووخانی دیکتاتۆریەت. سەرکەوتنەکه سەرکەوتنی گەل هەمووی بوو به سەرجەم ڕەوت و لایەن و پێکهاتەکانیەوە، دیاره بزاڤه ئیسلامییەکانیش بەپێی قەباره و قورسایی خۆیان بەشێکی باش له سەرکەوتن و دەستکەوتەکانی شۆڕشەکانیان بەردەکەوێت. زۆر له ڕێبەرانی ئیخوان ڕاشکاوانه دان بەو ڕاستییەدا دەنێن که شۆڕش و ڕاپەڕینەکه تایبەت به لایەنێکی دیاریی کراو نییە، بەڵکو شۆڕشی گەله به گشتی و لاوان به تایبەتی. بەڵام له گشت حاڵەتێکدا کار و چالاکی کەڵەکەبووی دەیان ساڵەی بزاڤه ئیسلامییەکان و بەرهەڵستیکردنی سەرسەختانەیان له بەرامبەر فشار و سیاسەته ستەمکارییەکانی ڕژێمه دیکتاتۆریەکانەوە، هۆکارێکی گرنگ و فاکتەرێکی کاریگەره له زەمینه سازکردن بۆ سەرهەڵدانی شۆڕش و ڕاپەڕینه جەماوەرییەکان و سەرکەوتنیان له ڕووخاندنی ڕژێمەکاندا.

هۆکاری دەرچوونی لایەنه ئیسلامییەکان له هەڵبژاردنەکاندا–بەتایبەتی ئیخوان–دەگەڕێتەوە بۆئەوەی که سەردەمی دیکتاتۆریەت حساب ناکرێت لەسەر ڕەوتی ئیسلامی، بەڵکو حسابه لەسەر ڕەوته عەلمانییەکان به لیبراڵ و چەپەکانیشەوە، بۆیه جەماوەر متمانەی بەو هێزانه نەماوه و پشتگیریی لایەنه ئیسلامییەکان دەکەن.

بەڵگه لەسەر ئەو ڕاستییەی سەرەوه ئەوەیه که هێزه ئیسلامییەکان ئێستاش ناتوانن خۆیان به تەنها پرۆژەی فیکری و سیاسیی خۆیان به ویست و قەناعەتی خۆیان ڕابگەیەنن و به ئەنجامی بگەیەنن. بەڵکو پێویسته به بەشداریی هەموو لایەك مومارەسەی پرۆسەی حوکمڕانی بکەن. هۆکارەکەشی ئەوەیه که که پێشتر

روئیایەکی ڕۆشنیان نەبووە بۆ ئەم ڕووداوە گەورە و ئەو گۆڕانکارییە گەورەیە کە ڕوویدا، خۆشیان بۆ ئامادە نەکردووەو چاوەڕێشیان نەکردووە. ڕاستە زۆرینەی پەرلەمانیان بەدەستەوەیە، بەڵام ئایندەی وڵات بە تایبەتی لە میسر بە پلەی یەکەم و وڵاتانی تریش، لە قۆناغی ڕاگوزەر (المرحلة الانتقالية)دایە و بزاڤە ئیسلامییەکان لە بەردەم تاقیکردنەوەیەکی گەورەتر لە قۆناغی پێشودان و سەنگی مەحەك بۆ سەرکەوتنیان لە پرۆسەی حوکمڕانیدا، لێرە بەدواوە دەردەکەوێت.

## بزاڤە ئیسلامییەکانی عێراق و هەرێمی کوردستان

ئەگەر بێینە سەر باسی حاڵەتی ئیسلامی لە عێراق و هەرێمی کوردستاندا، دیارە کە بە حوکمی سروشتی پێکهاتەی دیموگرافیایی عێراق، دانیشتوانەکەی دابەشبووە بەسەر سێ پێکهاتەی سەرەکیدا: (عەرەبی سوننە، عەرەبی شیعە، کورد) وێڕای تورکمان و کلد و ئاشووری و چەندین کەمایەتیی تری ئاینی و ئیتنی، هەرچی نەتەوەی تورکمانە ئەوانیش بە شێوەیەك لە شێوەکان دابەش بوون بەسەر سوننە و شیعەدا. بێگومان بزاڤی ئیسلامیش وەك زۆربەی بزاڤ و ڕەوتە سیاسییەکانی تر، ئەمانیش دابەش بوون بەسەر ئەو سێ پێکهاتە سەرەکییەدا و تاڕادەیەکی زۆر مۆرك و تایبەتمەندێتیی ئەو ناوچانەیان وەرگرتووە.

بزاڤی ئیسلامی لە ناوچەکانی شیعەدا ڕاستە کە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، بە تایبەتی لە سەردەمی ڕژێمی بەعس و دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامیی گەلانی ئێران، خەبات و چالاکیی بەرچاویان دەست پێ کردووە و ڕووبەڕووی هێرش و پەلاماری دڕندانە و سیاسەتی ڕیشەکێشکردن بوونەتەوە و قوربانیی گەورەیان لەو پێناوەدا بەخشیوە. بەڵام لە دوای ڕووخانی ڕژێم لە لایەن ئەمریکا و هاوپەیمانەکانیەوە، لایەنە ئیسلامییە شیعەکان بە هەموو قورسایی

خۆیان هاتوونەتە سەر شانۆی سیاسی و بوونەتە بەشی سەرەکی لە نەخشەی سیاسیی عێراقی دوای ڕووخانی ڕژێمی دیکتاتۆر، بە تەواوی کۆنترۆڵی بەغدا و پارێزگاکانی باشووریان کردووە. بەڵام بە داخەوە لە هەندێ ڕووەوە سیاسەتێکی نادروستیان گرتووەتە بەر، ئەویش بە فەرامۆشکردنی یاسایەکی گرنگ و پێویست بۆ سەرکەوتنی هەر پرۆژەیەکی چاکسازی و گۆڕانسازیی ڕاستەقینە. ئەو سیاسەتە نادروستەش بریتییە لە چۆنێتیی مامەڵەکردنیان لەگەڵ سەرجەم نەیارەکانیان بە گیانی تۆڵەسەندنەوە و ڕق و کینەی مێژینەی ڕابوردووەوە، کە تائێستاشی لەگەڵدا بێت، بووەتە هۆکارێکی سەرەکی بۆ ناسەقامگیری و جێگیر نەبوونی باری ئاسایش لە عێراقدا. ناتوانن متمانە و دڵنیایی بدەن بە پێکهاتەکانی تری عێراق، بە تایبەتی عەرەبی سوننە. بەو هۆیەشەوە زەمینەی لەبار ناڕەخسێت بۆ دوورخستنەوەی مەترسییەکان و دابینکردنی ئاسایش و سەقامگیری و بەشداریکردنی ڕاستەقینەی هەموو لایەك لە پرۆسەی سیاسیدا و ڕێگا خۆشکردن بۆ قۆناغی سەرلەنوێ بیناکردنەوەی عێراق و بەئەنجام گەیاندنی پرۆژەکانی ئاوەدانکردنەوە و گەشەپێدان.

دیارە ئەوەش هەڵەیەکی ستراتیژیی چارەنووسسازە و هیچ ئاسۆیەکیش بەدی ناکرێت بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵە و سیاسەتە نادروستە.

هەرچی بزاڤی ئیسلامیی ناوچە سوننییەکەشە، کە بەشە سەرەکییەکەی بزاڤێکی ئیخوانییە، لەژێر ناوی حیزبی ئیسلامیی عێراقیدا، هەر لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەمەوە، لەژێر ئەو ناوەدا خۆیان ڕاگەیاندووە. حاڵی ئەمانیش لە عێراق بە تایبەتی لە دوای هاتنی ڕژێمی بەعسەوە، لە ساڵی ١٩٦٨ بەدواوە، لە حاڵی بزاڤی ئیخوانی لە وڵاتانی تری عەرەبی، نەك هەر باشتر نەبووە، بەڵکو دەتوانین بڵێین زۆر خراپتر و بێ بەرنامەتر بووە. نەك هەر ستراتیژ و روئیایەکی ڕۆشنیان نەبووە، بەڵکو لە هەلومەرجێکی زۆر ئاڵۆز و گوماناویدا بڕیارێکی سەیر و سەمەرەیان وەرگرت لە ساڵی ١٩٧١دا بۆ ڕاگرتنی کاری

ڕێکخستن و سڕکردنی زۆربەی زۆری کار و چالاکییەکانیان و چوونە سوڕی متبوونی درێژخایەنەوە. سەیر لەوەدا بوو ئەو بڕیارە پارێزگاکانی کوردستانیشی گرتبوویەوە بێ هیچ پاساوێك و بەبێ ئەوەی هیچ بەشداربوونێکیان بووبێت لە وەرگرتنی ئەو بڕیارەدا و ڕاوێژیان پێ کرابێت. لە حاڵێکدا هەلومەرجی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی ناوچە کوردییەکان زۆر جیاواز بوو لە بەشەکانی تری عێراق و پێویستی بە بڕیاری خۆمتکردن و خۆسڕکردنی لەو بابەتە نەبوو، بە تایبەتی لە ساڵانی سەرەتای حەفتاکاندا، دوای ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١/ئازار/١٩٧٠ لەنێوان ڕژێم و سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردیدا، کەشوهەوایەکی تاڕادەیەك ئازاد و کراوە و دوور لە هەیمەنەی ڕژێم، باڵی کێشابوو بەسەر پارێزگاکانی کوردستاندا و زەمینەی دەعوە و چالاکیی ئیسلامی زۆر ئاسایی و سروشتی بوو.

دەرهاویشتەکانی ئەو حاڵەتە ناتەندروستەی کە تووشی بزاڤی ئیخوانی عێراقی هاتبوو، لە دوای ڕووخانی ڕژێم لە چۆنێتی مامەڵەکردنیان لەگەڵ ئەو بارودۆخە سیاسییەی هاتە کایەوە، بە تەواوی دەرکەوت، چونکە بەداخەوە نەیانتوانی ستراتیژ و ڕوئیایەکی ڕۆشن و بەرنامە بۆ کراو بگرنەبەر، کە هەموان لەسەری کۆك بن. لە نێوان موقاوەمەکردنی ئیحتیلال و مشارەکە لە پرۆسەی سیاسیدا، دووچاری ئاستەنگ و پاشەکشەی گەورە و پەرتەوازە بوون هاتن. لە ئاکامی ئەو دۆخە نادروستەدا، ڕۆڵی کارا و قورسایی خۆیان لەدەستداو بوون بە هێزێکی لاواز و پەراوێزخراو لە هاوکێشە ئاڵۆزەکەی عێراقی دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعسدا!

دیارە کە بزاڤی ئیسلامی لە کوردستاندا، لە ڕابوردوودا بەشێك بووە لە بزاڤی ئیخوانی و هاوشێوەی بەشەکەی تری ناوچە سوننییەکان بووە و زیاتر وەك بزاڤێکی ئیسلامیی عێراقی هەڵسوکەوتی کردووە و زۆر کەم کوردستانیبوونی پێوە دیاربووە، بەڵام لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو بەدواوە و دوای

سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامیی گەلانی ئێران، تاڕادەیەك کار و چالاکیی ئیسلامی لە بۆنەکانی مانگی ڕەمەزان و ساڵیادی لەدایکبوونی پێغەمبەر و بۆنەکانی تریشدا، گەشەی کرد. هەر لەو ماوەیەدا لێرە و لەوێ هەندێ هەوڵی دووبارە ڕێکخستن لە چەند میحوەرێکەوە دەستی پێکرد، هاوزەمان بیر و بۆچوونی جیهادیی چەکداری سەری هەڵدا لەژێر کاریگەریی جیهادی گەلی ئەفغانی و وەك کاردانەوەیەك بۆ بەرەنگاربوونەوەی سیاسەتە شۆڤێنییەکانی ڕژێم دژ بە گەلی کوردستان. تا حاڵ گەیشتە ئەوەی کە لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٧دا و لە گەرمەی جەنگی نێوان ئێران و عێراقدا، بەبێ هەبوونی روئیا و ستراتیژێکی ڕۆشن، بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق دامەزرا. هاوتەریب لەگەڵ ئەو پەرەسەندنەدا، باڵە ئیخوانییەکەی کوردستان بە شێوازی جیاجیا و دوور لە ململانێی سیاسی، بە شێوەیەکی سنووردار بەردەوام بوو لەسەر کار و چالاکیی دەعەوی و پەروەردەیی خۆی.

لە دوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ و هاتنەکایەی ئەزموونی سیاسیی هەرێمی کوردستان لە سایەی پاراستنی نێودەوڵەتیدا، بەپێی بڕیاری (٦٨٨)ی ئەنجومەنی ئاسایش، بزووتنەوەی ئیسلامی کە باڵە چەکدارەکەی حاڵەتی ئیسلامیی هەرێمی کوردستان بوو، لە ڕووی فیکری و سیاسیشەوە نەیتوانی مەنهەجیەت و ستراتیژێك بگرێتەبەر کە گونجاو بێت لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی دوای ڕاپەڕین و ئەو هاوکێشە ئیقلیمی و نێودەوڵەتییەی کە لە دوای جەنگی دووەمی کەنداو لە عێراق و ناوچەکەدا، هاتە کایەوە. لە ئەنجامی ئەو وەزعە نەخوازراوەدا سەرکردایەتیی بزووتنەوەکە کۆنترۆڵی لەدەستدا و دووچاری ڕووبەڕووبوونەوەی دژوار و خوێناوی هات و سەرەنجام بەرەو لێکهەڵوەشانەوە و پەراوێز بوون ڕۆشت.

بەڵام باڵە ئیخوانییەکەی حاڵەتی ئیسلامیی کوردستان، کە یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان درێژەپێدەریەتی، بە پێچەوانەی بزوتنەوەی ئیسلامییەوە، لە دوای ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١)ەوە بە شێوەیەکی بەرنامەبۆکراو و لە

چوارچێوەی ستراتیژ و روئیایەکی تاڕادەیەکی باش و گونجاودا، توانیی نموونەیەکی کاری سیاسیی ئیسلامیی میانڕەوانەی هاوچەرخ پێشکەش بکات، کە بووە جێگای سەرنجڕاکێشان و نرخاندنی هەموو لایەك و بووە هێزی سێیەم لە دوای پارتی و یەکێتی.

لە دوای ڕووخانی ڕژێمی دیکتاتۆریی بەعس لە سەرەتای ساڵی٢٠٠٣داو کرانەوەی هەرێمی کوردستان بەسەر بەشەکانی تری عێراق و ئەو گۆڕانکارییە گەورە و ڕیشەییەی کە لەو قۆناغە بەدواوە ڕووی کردە هەرێمی کوردستان، یەکگرتووی ئیسلامی کوردستانیش دووچاری جۆرێك لە ڕاوەستان هات، چونکە نوێبوونەوە و گۆڕانکاریی پێویست و کاریگەری لە روئیا و ستراتیژیەتی خۆیدا ئەنجام نەدا. بەوهۆیەوە نەیتوانی ببێتە ئۆپۆزسیۆنێکی کارا و بەهێز بۆ ئەکتیڤکردنی پرۆسەی سیاسی و دیموکراسی لە هەرێمدا و کار بکات لەسەر ئەنجامدانی چاکسازیی ڕاستەقینە لە سیستمی سیاسیدا، چونکە کارکردن بۆ ئەو ئامانجە زەرورەتی ئەو قۆناغە بوو، تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت. لە هەمانکاتیشدا بۆشاییەکی ئاشکرابوو، چاوەڕێ دەکرا کە ڕەوتی ئیسلامی بە گشتی و یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان بە تایبەتی، بەو ئەرکە سیاسی و نیشتیمانییە هەڵسێت، بەڵام بەداخەوە بەو ئەرکە هەڵنەسا و بەو هۆیەوە تاڕادەیەك متمانەی جەماوەر پێی کەمبووەوە و ڕێگا خۆش بوو بۆ سەرهەڵدانی (بزووتنەوەی گۆڕان)، کە توانیی ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە و جڵەوی دەستپێشخەریی ئۆپۆزسیۆنیبوون بگرێتە دەست و ببێتە هێزی ڕکابەری سەرەکیی بەرامبەر بە دەسەڵات و پشتیوانیی بەشێکی باش لە جەماوەر بەلای خۆیدا ڕابکێشێت.

ئێستا دوای ئەوەی زیاتر لە دوو ساڵ بەسەر شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی بەهاری عەرەبی و خۆپیشاندانەکانی هەرێم لە ١٧/شبات/٢٠١١دا تێدەپەڕێت، پرۆژەی چاکسازیی ڕاستەقینە لە سیستمی سیاسیی هەرێمدا، هەروەك خۆی چەق بەستووە و هیچ هەنگاوێکی جیددی لەو بوارەدا نەنراوە، بەڵکو سەرباری ئەوەش

ڕووداوە نەخوازراوەکانی ٢٠١١/١٢/٢شی بەدوادا هات کە دژ بە بارەگاکانی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان لە دەڤەری بادینان ئەنجامدرا. هەروەك قەیرانی سیاسیی عێراق و ئاڵۆزبوونی پەیوەندییەکانی نێوان هەولێر و بەغدا باڵی کێشاوە بەسەر ڕەوشی سیاسیی هەرێمدا و پرۆسەی چاکسازیی سیاسی لە هەرێمدا تاڕادەیەکی زۆر کاڵ بووەتەوە. بۆیە ئێستا دوای ئەو ڕووداو و پەرەسەندنانە، کاتی ئەوە هاتووە کە یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان و لایەنەکانی تری ڕەوتی ئیسلامیی کوردستان بە گشتی، خوێندنەوەیەکی باشتر بۆ بارودۆخەکە بکەن و بیر لە داڕشتنی روئیا و ستراتیژێکی نوێ بکەنەوە، کە بگونجێت لەگەڵ قۆناغەکەدا.

ئەوەی کە پێویستە هەموو لایەك لەسەری کۆك بن، ئەوەیە کە هەرێمی کوردستان لەم قۆناغە هەستیار و ئاڵۆزەی کە عێراق و ناوچەکەی پێدا دەگوزەرێت، لەبەردەم سێ ئەرکی نیشتیمانی و نەتەوەیی گرنگدایە: یەکەمیان لەسەر ئاستی ناوخۆی هەرێم، کە بریتییە لە زەرورەتی بەئەنجام گەیاندنی پرۆسەیەکی چاکسازی و گۆڕانسازیی ڕیشەیی لە سیستمی سیاسیدا. دووەمیان لەسەر ئاستی عێراقە، کە هەرێمی کوردستان پێویستی بە کاری جیددی و پرۆژەی ڕۆشن هەیە بۆ گەڕاندنەوەی ناوچە جێ ناکۆکەکان و دانانی میکانیزمی کارا و گونجاو بۆ دەستەبەرکردنی داخوازییە دەستوورییەکانی هەرێم و چۆنێتی بەشداربوون لە دەسەڵاتی سیاسیی ناوەندا. سێیەمیشیان کێشەی نەتەوەیی پارچەکانی تری کوردستانە، بە تایبەت لە دوای ئەو گۆڕانکارییانەی کە شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی بەهاری عەرەبی هێناویانەتە کایەوە.

ئەو سێ ئەرك و ئامانجە سەرەکییانە پێویستی بە هاوکاری و پشتیوانیکردنی سەرجەم هێز و لایەنەکانی هەرێمی کوردستان هەیە بە ئۆپۆزسیۆن و دەسەڵاتیشەوە، بەڵام دیارە کە ئەولەویەت بۆ ئەنجامدانی چاکسازیی ڕیشەییە لە سیستمی سیاسیی هەرێمدا و ئەرکی سەرەکیی لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆنیش بە پلەی یەکەم ڕوودەکاتە ئەم بوارە گرنگە.

ئەو چاکسازی و گۆڕانسازییەی کە هێزەکانی ئۆپۆزسیۆن و ڕۆشنبیران و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و زۆربەی زۆری جەماوەری کوردستان داوای دەکەن، خواست و داخوازیی ڕەوا و زەرورین و بە زمان و تێگەیشتنی سەردەمیش تەعبیری لێ دەکەن. ئەویش بریتییە لە ڕاستکردنەوەی ئاراستەی نادروستی پرۆسەی سیاسی و ئیداری و ئابووری و جێبەجێکردنی ناوەرۆکی چەمکەکانی دیموکراسی و دەوڵەتی یاسا و دەوڵەتی دامەزراوەیی و بێلایەنکردنیان بەرامبەر هەموو لایەك، ئەنجامدانی گەشەپێدانی ئابووریی دروست و ڕێزگرتنی تەواو لە مافەکانی مرۆڤ و دابەشکردنی دادپەروەرانەی سەروەت و سامانی وڵات و بنەبڕکردنی گەندەڵی و دوورخستنەوەی دەستێوەردانی حیزب لە دامودەزگاکانی حکومەت بە شێوەیەکی کرداری و لەسەرئەرزی واقیع، نەك وەك ئەوەی کە ئێستا مومارەسە دەکرێت، کە تەنها دروشمبازی و پروپاگەندەی بێ ناوەرۆکن.

لە کۆتایی ئەم بەشەدا ماوەتەوە بڵێین، ئەوەی کە لە شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی گەلانی ناوچەکەدا ڕوویداوە، بە تایبەتی لە تونس و میسر و لیبیا و یەمەن، سەرکەوتنی بەدەستهێناوە ئێستاش لە سوریا بە شێوەیەکی خوێناوی و وڵاتانی تر بە شێوازی جیاجیا بەردەوامە ڕووداوی گەورەو چارەنووسسازن و خاڵی وەرچەرخانە لە حەرەکەتی مێژویی مرۆڤایەتیدا و سەرەتای سەردەمێکی نوێ و جیاوازە. ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینانەهەڵقوڵاوی ئایدۆلۆژیایەکی ئاینی یان عەلمانی نین و لەژێر دروشمی ڕەها و ناونیشانی تەقلیدیدا بەرپا نەبوون، بەڵکو شۆڕشی سەرجەم گەلانی ئەو وڵاتانەن بە هەموو پێکهاتە و توێژ و چینەکانیانەوە، لە دەرەوەی چوارچێوە ئاسنینە حیزبییەکان و قاڵبە ئەسمنتییەکانی ئایدۆلۆژیاوەن و زۆر جیاوازن لە شۆڕشە گەورەکانی یەك دوو سەدەی ڕابوردوو، کە تەنها یەك دروشم و یەك گوتار و یەك ڕابەری کاریزما و ڕزگارکەر پێشەوایەتیی دەکردن.

شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبی هەڵقوڵاوی ئەم سەردەمەن، کە بە شۆڕشەکانی نەرمە هێز (ثورات القوة الناعمة)[15] دەناسرێن و بەرهەمی سەردەمی تەکنۆلۆژیای مەعلوماتییە و ئەوانەی کە پێی هەڵدەسن لە هەموو چین و توێژ و ئاراستە و بیر و باوەڕێکن، بە تایبەتی نەوەی نوێ و لاوان، کە باش شارەزای بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیای نوێن و ئامانجی هەموو لایەك ڕزگاربوونە لە ستەمکاریی سیاسی و گەندەڵی و ناعەدالەتی و شەیدای ئازادی و یەکسانی و کەرامەتی مرۆڤن.

ئێستا دوای ئەو هەلومەرجە نوێیەی کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ناوچەکەدا هاتووەتە کایەوە، جێگای خۆیەتی و کاتی ئەوە هاتووە کە بزاڤە ئیسلامییەکان بە شێوەیەکی ڕاست و دروست مامەڵە لەگەڵ ڕەوتی ڕووداوەکان و گۆڕانکارییەکانی ئەم قۆناغە مێژووییەدا بکەن و هەوڵ بدەن بە هاوکاریی هەموو لایەك و لەسەر بنەماکانی پێکەوەژیان و ئاشتیی کۆمەڵایەتی: بەشداریی کارا بکەن لە دامەزراندنی دەوڵەتی مەدەنی و دیموکراتی بە مەرجەعیەتی ئیسلامی. پێویستە دەوڵەت و دەزگاکانی بێلایەن بن و لە دوورییەکی یەکسان ڕاوەستن لە ئاست هەموو لایەك، بە جیاوازیی ئاین و مەزهەب و ئینتیمای ئیتنی و فیکری و سیاسییانەوە. چونکە بەهێزترین گەرەنتی بۆ سەرکەوتنی ئەزموونی ئیسلامییەکان لە حوکمڕانیدا، لەوەدایە کە بتوانن بەشداریی جیددی بکەن لە جێگیرکردنی سیستمێکی حوکمڕانی کە ئازادی و دادپەروەری و یەکسانی بۆ هەموان لەسەر بنەمای هاوولاتیبوون دەستەبەر بکات و ڕێگا لەبەردەم هەموو کەسێکدا کراوە بێت بۆ پێشکەشکردنی هەموو جۆرە بیرۆکە و دەستپێشخەری و داهێنانێك.

ئیسلامییەکان پێویستە بە هەموو توانایانەوە کار بکەن بۆ دابینکردنی ئازادی بۆ هەموو لایەك و لەوە دڵنیابن کە ئیسلام و لایەنە ئیسلامییەکان

---

[15] علي حرب، ثورات القوة الناعمة في العالم العربي، بيروت- لبنان، ط١، ٢٠١١، ص٩.

گەورەترین سوودمەند دەبن لە ئازادی و دیموکراسی، هەروەك گەورەترین زەرەرمەند بوون لە دیکتاتۆریەت و ستەمکاریی سیاسی. نابێ چیتر ڕێگا بدەن کە بە ناوی پاراستنی ئایینەوە دەرگای ئازادییەکان تەسك بکرێتەوە، هەروەك نەدەبوو و نابێت کە بە ناوی ئازادیشەوە ڕێگا لە ئایین و ئاینداری و بانگەوازی ئیسلامی بگیرێت.

ئیسلامییەکان و ئیسلامخوازان پێویستە ئەو ڕاستییە مێژووییە وەبیر خۆیان بهێننەوە: کاتێك پێغەمبەری ئیسلام (دروودی خوای لەسەر بێت) لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا گەیشتە نزیك دەروازەکانی شاری مەککە بە مەبەستی بەجێهێنانی (عومرە)، پێش گرێدانی ڕێکەوتنی (حودەیبیە). ئەوەبوو قورەیشەکان ڕێگایان لێ گرت و نەیانهێشت بچێتە ناو شاری مەککە و هەڕەشەی شەڕ و کوشتاریان کرد. ئا لەو کاتە هەستیار و ناسکەدا فەرمووی: (ویح قریش لقد اکلتهم الحرب، ماذا علیهم لو خلوا بیني وبین سائر الناس..) پێغەمبەری خوا بە هیچ شێوەیەك بە دوای شەڕ و کوشتاردا نەدەگەڕا، بەڵکو تەنها ئەوەی دەویست کە بە ئازادی بانگەواز و بانگەشە بۆ پەیامەکەی بکات. چونکە لەو ڕاستییە دڵنیابوو کە هیچ شتێك وەك کەشوهەوای ئازادی بەسوود نابێت بۆ ئیسلام و بانگەشەکردن بۆ خێر و چاکە و پەروەردەی دروست و بەرپابوونی سەقامگیری و دەستەبەرکردنی دادپەروەری بۆ هەموو لایەك. هەر ئەوەش ڕێگای پێشکەوتن و گەشەکردنی کۆمەڵگە موسڵمانەکانە.

# بەشی سێیەم:
# خوێندنەوەیەك بۆ شۆڕش و ڕاپەڕینەكانی گەلانی ناوچەكە

## هۆكار و پاڵنەرەكان

ئەو ڕووداو و گۆڕانكارییانەی كە لەماوەی ئەم دوو ساڵەدا لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕوودەدەن، لەشێوەی ڕاپەڕین و شۆڕشی جەماوەریدا، كە هەندێ جار بە بەهاری عەرەبی یان ئیسلامی ناوزەد دەكرێن، لەڕاستیدا بەرەنجامی كەڵەكەبوونی مەعریفی و حەرەكەتی مێژوویی گەلانی ناوچەكەیە. بەڵام دیسان ئەوەش ڕاستە كە خێراییەكەی و فراوانییەكەی لە ئاستی چاوەڕوانكراو و پێشبینیكردنی چاودێرانی سیاسی و كۆمەڵایەتی زۆرزیاتر و قووڵترە. دیارە لەهەر گۆڕان و ڕووداوێكی لەم چەشنەدا، حەرەكەتی گۆڕانكاریەكان خێراتر و گەورەتر دەبێت، وەك حەرەكەتی تۆپەڵەبەفرێك كە لەبەرزایی چیایەكی بەفرینەوە بەرەوخوار خلۆردەبێتەوە... بۆیە ڕووداوەكانی ئەم دواییە وامان لێ دەكەن چاوەڕوانی گۆڕانی زۆر گەورەتر بكەین، چونكە هەتا چالاكی و زیندوێتی لەناو كۆمەڵگاكاندا كاراتر و خێراتر بێت، ئەوا ڕووداو و گۆڕانكاریی گەورەتر بەدوای خۆیدا دێنێتەكایەوە. ئەڵبەت هەندێ لە بیرمەندان و توێژەرانی فیكری سیاسی و كۆمەڵایەتی، بەكارهێنانی زاراوەی شۆڕش بە دروست نازانن و پێیان وایە ئەم ڕووداوانە ڕاپەڕینی گەلانی ناوچەكەیە، چونكە شۆڕش هەمیشە بەرنامە بۆكراوە و سەركردایەتییەكی كاریزمی لە پشت شۆڕشەكانەوەیە، بەڵام ڕاپەڕین بە شێوەیەكی كوتوپڕ و چاوەڕوان نەكراو لە هەلومەرج و چركە ساتێكی نائاساییدا ڕوو دەدات.

له لایەکی ترەوە ئەم ڕووداو و گۆڕانکارییانە ئەو ڕاستییەمان وەبیردێننەوە کە حەرەکەتی مێژوو یاسا و ڕێسای تایبەت بە خۆی هەیە و لە سەر یەك حاڵەت ڕاناوەستێت. نەتەوەیەك یان ئوممەتێك ئەگەر لە حاڵەتی پێشکەوتن و بەهێزیدا بێت، مەرج نییە تا سەر بەو شێوەیە بەردەوام بێت، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر نەتەوەیەك یان ئوممەتێك لە حاڵەتی دواکەوتن و لاوازیدا بێت، مەرج نییە هەر بەوشێوەیە بەردەوام بێت. چونکە بەهێزبوون و لاوازبوون یان پێشکەوتن و دواکەوتن، خاسیەتی زاتی و هەمیشەیی نین بۆ هیچ ئوممەت و نەتەوەیەك، بەڵکو بەستراوە بە چەندین هۆکاری زاتی و بابەتییەوە کە ئەگەری ئەوە هەیە لە هەر هەلومەرجێکدا گۆڕانیان بەسەردا بێت.

زۆر جار روو دەدات کە ڕووداوێکی بە ڕواڵەت بچکۆلە و سادە دەبێتە هۆکاری سەرهەڵدانی ڕووداو و گۆڕانکاریی زۆر گەورە و فراوان، وەك ئەوەی لە تونس ڕوویدا دوای خۆسووتاندنی (موحەممەد بوعزیزی) کە گەنجێکی دەرچووی زانکۆ بوو، کاری عەرەبانچێتیی دەکرد، بەڵام پۆلیس ڕێگایان لێگرت و سوکایەتییان پێکرد، ئەویش لە کاردانەوەدا ئاگری لەخۆی بەردا، وەك ڕەتکردنەوەیەك بۆ ئەو حاڵەتە ناهەموارەی ڕووبەڕووی سەدان و بگرە هەزاران لاوی خوێنگەرمی نەوەی نوێ دەبێتەوە لەناو گەلانی ستەمدیدەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. ئەو هەڵوێستەی موحەممەد بوعەزیزی تەعبیر بوو لەو حاڵەتی هەستکردنە بە ناعەدالەتی و پێشێلکردنی کەرامەتی مرۆڤەکان و ئەو دواکەوتنە ژیارییەی کە بۆ دەیان ساڵە ڕووبەڕووی گەلانی ناوچەکە بووەتەوە و لەناخی تاکەکانیدا پەنگی خواردووەتەوە. بۆیە ئەو هەڵوێستە تاکەکەسییە ڕاستەوخۆ گۆڕا بۆ شۆڕش و ڕاپەڕینێکی جەماوەریی گەورە و لە ماوەیەکی کەمدا زۆربەی وڵاتانی ناوچەکەی گرتەوە.

ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینە جەماوەرییە فراوانەی ڕووی کردووەتە وڵاتانی ناوچەکە، **هاوزەمان** ڕەتکردنەوە و کاردانەوەیە بە سێ ئاڕاستە، **ئاڕاستەی یەکەمیان** دژ بە ڕژێمە سیاسییە دیکتاتۆرییەکان، کە بۆ دەیان ساڵە بە ناوی

ناسیۆنالیستی یان سۆسیالیستی یان ئایین و عەلمانیەتەوە، حوکمی ئەم وڵاتانە دەکەن و گەندەڵی و ناعەدالەتی گشت جومگەکانی ئەو ڕژێمانەی گرتووەتەوە لەگەڵ ئەوەشدا بە پشتبەستن بە دەزگای ئەمنیی داپڵۆسێنەر ڕێز و کەرامەتی مرۆڤیان لەم وڵاتانەدا پێشێل کردووە و نموونەی دواکەتووترین دەسەڵاتی سیاسی و حوکمڕانییان پێشکەش کردووە. **ئاڕاستەی دووەمیان** دژبە ستراتیژیەت و ڕێبازی پەنابردنە بۆ عونف و توندوتیژی، کە ڕێکخراوی (قاعیدە) و ڕەوتە هاوشێوەکانی لەم وڵاتانەدا گرتوویانەتەبەر بۆ گۆڕینی ڕژێمە سیاسییەکان یان دژ بە وڵاتانی خۆرئاوا. ئەو ستراتیژیەتەی کە شکستی خواردووە لە ناوخۆی ئەم وڵاتانەدا، بەوەی کە زیاتر پاساوی دا بەدەست ڕژێمە دیکتاتۆرەکانەوە بۆ پەنابردن بۆ ڕێگاچارەی ئەمنی و بەرتەسککردنەوەی ئازادییەکان و سەرکوتکردنی هەموو دەنگێکی نەیار و جیاواز. ئاشکرایە ستراتیژیەتی قاعیدەش دژ بە ئەمریکا و وڵاتانی خۆرئاوا، بووە هۆی بەرپاکردنی جەنگی دژە تیرۆر، بە تایبەتی لە دوای ڕووداوەکانی ١١/ سێپتەمبەر/٢٠٠١ و لەو بەروارە بەدواوە، ڕژێمە دیکتاتۆرەکانی وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی توانییان لە بەرژەوەندیی خۆیان سوودی لێ وەربگرن بۆ درێژەدان بە مانەوەی خۆیان، بە بەرتەسککردنەوەی زیاتری ئازادییەکان و توندترکردنی ڕێوشوێنی ئەمنی دژ بە نەیارانی سیاسی. لە وڵاتانی ڕۆژئاواش بووە هۆی ناشیرینکردنی زیاتری وێنای ئیسلام و موسڵمانان لەسەر ئاستی جیهانی و ڕێگاخۆش بوو بۆ هەر دەنگ و ئاراستەیەکی دژ بە ئیسلام و موسڵمانان لەو وڵاتانەدا. **ئاڕاستەی سێیەمیش** دژ بە سیاسەتی دووفاقی و دووپێوانەییە کە ڕۆژئاوا و زلهێزەکانی دونیا مومارەسەی دەکەن لەئاست ئەم وڵاتانەدا و پشتیوانی کردنیان لە ڕژێمە دیکتاتۆرییەکان و حساب نەکردنیان بۆ گەلانی ناوچەکە.. بە تایبەتی لە مەسەلەی پشتیوانیکردنی بێدرێغ و بێسنووریان بۆ دەوڵەتی ئیسرائیل.

پرۆژەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەورە یان ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی نوێ، کە ئیدارەی کۆمارییەکانی ئەمریکا لە سەردەمی ئیدارەی جۆرج بۆشی کوڕدا

گرتیانەبەر و لە چوارچێوەی جەنگی دژە تیرۆردا ڕژێمی تاڵیبان لە ئەفغانستان و ڕژێمی سەدام حسێن یان لە عێراق بە داگیرکردنی سەربازی ڕووخاند، ئەو ستراتیژیەش شکستی هێناو نەیتوانی ئازادی و کرانەوەی دیموکراسی بۆ وڵاتانی ناوچەکە دەستەبەر بکات. زۆری نەخایاند ئیدارەی ئەمریکا ناچاربوو بێدەنگیی لێ بکات و پەیوەندیی خۆی لەگەڵ ڕژێمە دیکتاتۆرەکان بەهێز بکاتەوە، لەپێناو دەربازبوون لەو زەلکاوەی تێی کەوتووە لە هەریەك لە عێراق و ئەفغانستان.

ئەم ڕووداوانە کە هاوزەمانن لەگەڵ ئەو پێشکەوتنە فراوانەی تەکنۆلۆژیای گەیاندن و شۆڕشی مەعلوماتی و هوشیاربوونەوەی نەوەی نوێ لەم وڵاتانەدا و هەستکردنیان بە ناعەدالەتی و دواکەوتنی وڵاتەکانیان و بێئومێدبوونیان لە هەر پرۆژەیەکی چاکسازیی ڕیشەیی کە ڕژێمەکان بتوانن جێبەجێی بکەن، تەنانەت بێئومێدبوونیان لە حزب و ڕێکخراوە سیاسییەکان و نوخبە تەقلیدییەکان، کە بتوانن فشار لەسەر ڕژێمەکان دروست بکەن یان ڕێبەرایەتیی گۆڕان و چاکسازی بکەن. هەموو ئەو هۆکارانە هەلومەرجێکیان هێنایە کایەوە کە جەماوەر بە گشتی و توێژی لاوان بە تایبەتی، ناچار ببن هەموو لایەك تێپەڕێنن و خۆیان بە شێوەیەکی خۆڕسکانە ڕادەنە مەیدان و شۆڕش و ڕاپەڕینی گەورە بەرپا بکەن. شۆڕش و ڕاپەڕینە جەماوەرییەکان و ئامادەیی لاوان بۆ قوربانیدان، لەئاستێکدایە کە نەك تەنها حیزبە تەقلیدییەکانی هێناوەتە سەر خەت، بەڵکو ڕۆژئاوا و ئەمریکاشیان ناچار کرد چاو بە ستراتیژیەت و سیاسەتی دووپێوانەیی خۆیاندا بخشێننەوە و هەوڵ بدەن وێنای ناشیرین بووی خۆیان لای گەلانی ناوچەکە کەمێك ڕاست بکەنەوە، ئەوەش بە پشتیوانیکردنیان لەو شۆڕش و ڕاپەڕینە جەماوەرییانە و فشار دروستکردن لەسەر ڕژێمە داپڵۆسێنەرەکان بۆ دەست هەڵگرتن لە پەنابردن بۆ زەبروزەنگ و بەکارهێنانی هێز بە شێوەی فراوان.

## ئاماژە و کاریگەرییەکان

ئەم ڕووداو و گۆڕانکارییە گەورانەی کە لەم ماوەیەدا لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕوودەدەن، سەرجەمیان ڕووداو گەلێکن کە ناکرێ بە پێوەری ڕووداوە ئاساییەکان هەڵسەنگاندنیان بۆ بکرێت، بەڵکو پێویستە بەپێی پێوەرە گەورەکانی گۆڕانی ژیاریی و شارستانیەتەکان مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت. ئەم ڕووداوانە بە هەموو پێوەرێك بەڵگەن لەسەر وەرچەرخانێکی مێژوویی گەورە و هەمەلایەنە و سەرهەڵدانی قۆناغێکی مێژوویی نوێ، کە بێگومان گۆڕانکاری لەسەر ئاستی جیهانی و نێودەوڵەتیش بە دوای خۆیاندا دێنێتەکایەوە. ئەم ڕووداوانە هەلومەرجێك دەڕەخسێنن کە ببنە هۆی پێداچوونەوە و چاوخشاندنەوە بە (تیۆرەکانی کۆتایی) سەبارەت بە کۆتایی ئاین یان کۆتایی مێژوو.

یەکێکی تر لە دەرهاویشتەکانی ئەم ڕووداو و گۆڕانکارییانەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەوە دەبێت کە سیستەمی جیهانی و نێودەوڵەتی بە شێوەیەکی تر دابڕێژرێتەوە. ئەوەبوو لە دوای جەنگی جیهانیی یەکەم و هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، سیستەمی جیهانی لەسەر بنەمای هاوسەنگیی هێزەکان (وڵاتە زلهێزەکان) دامەزراو کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبة الأمم)ی لێ کەوتەوە. بەڵام دوای جەنگی جیهانیی دووەم و لەنگەرگرتنی جیهان لە نێوان دووجەمسەری هێزدا و هاتنەکایەی قۆناغی شەڕی سارد، سیستەمی جیهانی لەسەر بنەمای پاراستنی بەرژەوەندیی زلهێزەکان داڕێژرایەوە. ئەوەبوو لە قۆناغی شەڕی ساردا مافی گەلە ژێردەستەکان و کەمینەکان پێشێل کرا، یەکێك لەوانە گەلی کوردبوو. ئەو هەلومەرجە درێژەی کێشا تا کۆتایی هەشتاکان و داڕووخانی یەکێتیی سۆڤیەت و لێك هەڵوەشانەوەی بلۆکی کۆمۆنیستی. ئەو کاتە سیستەمی جیهانی تاك جەمسەری بە سەرکردایەتیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هاتەکایەوە و ڕەهەندی مافی مرۆڤ و مافی کەمینەکان بوو بە یەکێك لە بنەماکانی سیستەمی

جیهانیی نویٚ، لەو میانەدا گەلانی وەك كورد لە عێراق و بۆسنیا و كۆسۆڤا و تەیموری شەرقی و چەندین ناوچەی تر، سوودیان لێ وەرگرت.

بەڵام دوای ئەم گۆڕانكارییانەی ئێستای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەڵسانەوەی گەلانی ناوچەكە، كە ناوجەرگەی جیهانی ئیسلامی پێكدەهێنن، ئەگەری ئەوە هەیە سیستەمی جیهانی لە ئایندەدا لەسەر بنەمای هاوسەنگیی ژیاریی (التوازن الحضاري) لە نێوان شارستانیەتی ڕۆژئاوا و شارستانیەتی ئیسلامی و شارستانیەتییەكانی تردا ڕێكبخرێتەوە و كۆتایی بەم قۆناغە ناهاوسەنگە بهێنرێت كە شارستانیەتی ڕۆژئاوا بە ناوی جیهانگیرییەوە لە هەوڵی سڕینەوەی تێكڕای كولتوور و شارستانیەتیە ناڕۆژئاواییەكاندایە. بێگومان ئەوەش یەكێكە لە خاڵە لاوازەكانی شارستانیەتی ڕۆژئاوا كە ناتوانێت دەرك بەو ڕاستییە بكات كە پێویستی بە شارستانیەتییەكانی تر هەیە و بەرژەوەندیی خۆیان و سەرجەم مرۆڤایەتی لەوەدایە بە ڕوئیایەكی نوێ و ئیجابییەوە مامەڵە لەگەڵ شارستانیەتییەكانی تر دا بكەن.

یەكێك لەو ئیشكالیەتانەی لە مێژە تووشی شارستانیەتی ڕۆژئاوا بووە و بەهۆیەوە خودی شارستانیەتیەكە و مرۆڤایەتی دووچاری قەیرانێكی گەورە بووەتەوە، پەیوەستە بە پەیوەندیی نادروست و دژواری نێوان ئیسلام و ڕۆژئاواوە. ڕووداوەكانی مێژووی نوێ و هاوچەرخیش شاهێدن لەسەر ئەوەی ئەم كێشەیە دژوارترین و ئاڵۆزترین كێشەی ژیارییە ڕووبەڕووی جیهان بووەتەوە، ڕووداوەكانی ١١/سێپتەمبەر/٢٠٠١و هاوشێوەكانی، تائێستاشی لەگەڵدا بێت، یەكێكە لە دەرهاویشتەكانی ئەو پەیوەندییە نادروستە. ڕاستییەكیش هەیە كە ڕۆژئاوا تا ئێستا وەك پێویست دەركی نەكردووە یان نایەوێت دەركی بكات و بە ئیجابی مامەڵەی لەگەڵدا بكات، ئەویش ئەوەیە كە ئیسلام هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانیەوە لە سەدەی حەوتەمی زایینیدا لەبەردەم هێزی هیچ شارستانیەتێكی تردا شكستی نەهێناوە و چۆكی دانەداوە، نە لەبەردەم

شارستانیەتی ڕۆمەکان و فارسەکاندا لە سەرەتای هاتنیدا، نە لەبەردەم شارستانیەتی خاچداران و مەغۆلەکاندا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، نە لەبەردەم شارستانیەتی ڕۆژئاواشدا لە سەردەمی نوێدا، لە ئێستا و ئایندەشدا لەبەردەم هیچ هێزێکی تردا هەرگیز شکست ناهێنێت. لە بەرژەوەندیی ڕۆژئاوا و جیهانیشە بە گشتی، کە ڕۆژئاواییەکان دەرك بەم ڕاستییە بکەن و پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئیسلام و جیهانی ئیسلامیدا ڕاست بکەنەوە و هەوڵبدەن سوود لە لایەنە مەعنەوی و ئەخلاقی و تەشریعییەکانی ئیسلام وەربگرن، لەپێناو بنیاتنانی ئایندەیەکی نوێ و گەشدا بۆ هەموو جیهان. هەروەك لە بەرژەوەندیی جیهانی ئیسلامیشە کە سوود لە پێشکەوتنە زانستی و تەکنۆلۆژیاکانی ڕۆژئاوا وەربگرن، بەڵام بە پاراستنی لایەنی ڕۆحی و مەعنەوی خۆیانەوە.

ڕووداو و گۆڕانکارییە گەورەکانی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەم ڕۆژانەدا، بەڵگەیە لەسەر زیندوێتیی گەلانی ناوچەکە و سەرەتایەکیشە بۆ قۆناغێکی مێژوویی نوێ کە تیایدا گەلانی ناوچەکە بتوانن لەسەر پێی خۆیان ڕاوەستن و ڕۆڵی کارا و ئیجابی ببینن لەسەر ئاستی جیهان، لە قۆناغی داهاتوودا. لە هەمان کاتیشدا ئاماژە بەوە دەکەن کە تیۆرەکانی گەورە بیرمەندانی ڕۆژئاوایی سەبارەت بە پێکدادانی شارستانیەتییەکان و کۆتایی هاتنی ئاین و مێژوو، پێویستیان بە پێداچوونەوە و ڕاستکردنەوەهەیە.

ئاماژەیەکی تری ئەم ڕووداوانە ئەوەیە کە هۆکاری دواکەتنی گەلانی موسڵمان ڕاستە ناگەڕێتەوە بۆ خودی ئاینی ئیسلام، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە دەگەڕێتەوە بۆ خراپ تێگەیشتن لە ئیسلام و خراپ مومارەسەکردنی بە هۆی دواکەوتوویی میللەتانی موسڵمانەوە بە گشتی و بە پلەی یەکەم هەیمەنەی ڕژێمە سیاسییە دیکتاتۆر و ئیستبدادییەکان، کە بۆ دەیان و بگرە سەدان ساڵە حوکمی ئەم میللەتانە دەکەن و ناهێڵن لەسایەی ئازادی و دادپەروەریدا بژین و ڕێگای پێشکەوتن و شارستانیەت بگرنەبەر. بەڵام ئێستا دوای هەرەسهێنانی ڕژێمە

دیکتاتۆرەکان، ڕێگا لەبەردەم ئەم کۆمەڵگایانەدا دەکرێتەوە بۆ سڕینەوەی ئاسەوارە سەلبییەکانی قۆناغەکانی ڕابردوو.

ئاماژەیەکی تری گرنگی ڕووداوەکانی ئەم دواییە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کۆمەڵگەکان و توێژی لاوان و نەوەی نوێ، کە تا ڕۆژانێکی کەمی پێش ڕاپەڕینە جەماوەرییەکەی تونس و میسر و وڵاتانی تری ناوچەکە، بە لاوازترین ڕەگەز و پێکهاتەی ئەم وڵاتانە دادەنران، هێزە نێودەوڵەتییەکان و ڕژێمە سیاسییەکانیش هیچ حسابێکیان بۆ نەدەکردن، تەنانەت حیزبە سیاسییە تەقلیدییەکان و نوخبەکانیش ئەوەندەی لە بیری ئەوەدا بوون کە چۆن مامەڵە لەگەڵ ڕژێمەکان و هێزە نێودەوڵەتییەکاندا بکەن، بە ئەندازەی ئەوە بیریان لەوە نەدەکردەوە کە چۆن بایەخ بە توێژی لاوان بدەن و بتوانن تەعبیر لە خواست و داواکارییەکانی جەماوەرە گشتییەکە بکەن و نوێنەرایەتیی ڕاستەقینەی کۆمەڵگە بکەن... بەڵام ڕووداوەکانی ئەم دواییە سەلماندیان کۆمەڵگەکان بە گشتی و نەوەی نوێ بە تایبەتی، زیندوترین و چالاکترین ڕەگەزی پێکهێنەرن لەم وڵاتانەدا...کۆمەڵگەکان و نەوەی نوێ لەوە دەرچوون کە پێویستیان بە (وصایة)ی حیزبەکان و ڕژێمە سیاسییەکان بێت، بەڵکو ئەوە کۆمەڵگەیە (وصایة) و چاودێری دەکات بەسەر دەوڵەت و ڕژێمە سیاسییەکانەوە.. سەرکەوتنی بزاڤە سیاسییەکان و نوخبە ڕۆشنبیرەکەش لەوەدایە کە تا چەند بتوانن نوێنەرایەتیی ڕاستەقینەی خواست و داواکارییەکان و ئێش و ئازارەکانی کۆمەڵگە بکەن، چونکە ئەوە کۆمەڵگەکان و نەوەی نوێن کە هوشیاربوونەتەوە و شۆڕش و ڕاپەڕین بەرپا دەکەن و قوربانیی گەورە پێشکەش دەکەن، لەپێناو دەرچوون لەم تونێلە تاریکەی کە ڕژێمە سیاسییەکان بۆیانی دروستکردوون. ئەم حاڵەتەی کە ڕووی کردووەتە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، عێراق و هەرێمی کوردستانیشی لێ بەدەر نییە. بەڵکو لە بەرژەوەندیی گەلی کوردە کە بە ئیجابی مامەڵە لەگەڵ ئەم هەلومەرجە نوێیەدا

بكات، چونکە بە شێوەیەکی گشتی لە بەرژەوەندیی گەلانی ژێردەستە و ستەم دیدەیە و سەردەمی هەڵسانەوەی گەلانی ناوچەکەیە.

ماوەتەوە ئەوە بڵێین لەم قۆناغە نوێیەدا قۆناغی چەقبەستویی و حاڵەتی جێگیری و مانەوە لە دۆخی ئاسایی و تەقلیدیبوونی ڕابردوودا بەسەرچووە. قۆناغی سیاسەتی ئاسایی و چالاکیی حیزبیی ئاسایی بەسەرچووە... جیهان بە گشتی و ناوچەکە بە تایبەتی، لە گۆڕان و نوێبوونەوەی خێرادایە، هیچ لایەك چاوەڕوانی لایەنەکانی تر ناکات. هەر گەل و نەتەوە یان لایەنێکی سیاسی بیەوێت بەهێز و پێشکەوتوو بێت و لە ئاست ڕووداو و گۆڕانکارییەکانی قۆناغەکەدا بێت، پێویستە گۆڕان و چاکسازیی ڕیشەیی لە خۆیدا ئەنجام بدات و خۆی نوێبکاتەوە.

چەمکەکانی (گۆڕان و چاکسازی و نوێبوونەوە)ش چەمکی قورئانی و ئیسلامیی ڕەسەنن و تەواوکاری یەکترن، پرۆسەی گۆڕان پێشەکییە بۆ ئەنجامدانی چاکسازی ڕاستەقینە، چاکسازیش دەبێتە هۆی نوێبوونەوە، بەو شێوەیە گەشەکردن و پێشکەتنی ژیان بەردەوام دەبێت.

# بەشی چوارەم:
# ڕەوتی ئیسلامی و پرسی دەوڵەتداری

## ئامانجی شۆڕش و ڕاپەڕینەکان

لە ئاکامی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی وڵاتانی عەرەبی و ڕزگاربوونی گەلانی ناوچەکە لە چنگی ڕژێمە دیکتاتۆرەکان و هاتنە پێشەوەی ڕەوتە ئیسلامییەکان بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات، ئامانجی سەرەکیی گەلانی ئەم وڵاتانە ئەوەیە کە لە زەبروزەنگی تاکڕەوی و ستەمکاریی سیاسی و کۆمەڵایەتی ڕزگاریان بێت و بگوازنەوە بۆ کەشوهەوای ئازادی و دیموکراسی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، هەروەها لە کولتووری داپڵۆسین و پەراوێزخستن و تۆقاندنەوە، بگوازنەوە بۆ کولتووری ئازادییە گشتییەکان و مافەکانی مرۆڤ و فرەلایەنی، هەروەك ئاواتەخوازن کە لە حاڵەتی گەندەڵی و مەحروم بوون و دواکەوتن و هەژاری دەرباز ببن و بگەنە ئاستی وڵاتانی پێشکەوتوو لە بوارەکانی گەشەپێدان و پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆژی و خۆشگوزەرانیدا. هەر لەو پێناوەشدا گەلانی وڵاتانی ناوچەکە ڕاپەڕین و شۆڕشیان بەرپا کرد و تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت لە چەند وڵاتێکی تردا بە شێوازی جیاجیا سوورن لەسەر بەخشینی گیان و ماڵ و ئارامیی خۆیان و لە درێژەدان بە شۆڕش و ڕاپەڕینەکانیان بەردەوامن.

گەورەترین دەرەنجامی ئەم شۆڕشانە ئەوەیە کە دەرگا لەبەردەم ڕەوتە ئیسلامییەکاندا کراوەتەوە بۆئەوەی ڕۆڵی ڕێبەرایەتی و فەرمانڕەوایەتی ئەم قۆناغە مێژووییە لە ئەستۆ بگرن. لەو سۆنگەیەوە ئەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ڕەوتە ئیسلامییەکانی ئەم وڵاتانە لەم قۆناغەدا ڕووبەڕووی بەرپرسیارێتیی مێژوویی و (تحديات)ی گەورە و گران بوونەتەوە، کە ئەویش بریتییە لە ئەزموونی حوکمڕانیکردنی گەلان و وڵاتەکانی خۆیان و دابینکردنی دادپەروەری و ئازادی و

پێشکەوتن و گەشەپێدانی ئابووری وخۆشگوزەرانی بۆ سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵگە، بە تایبەتی توێژی لاوان و چینە هەژار و کەمدەرامەتەکان.

ڕەوتە ئیسلامییەکان پێویستە ئەو ڕاستییە بە جیددی لەبەرچاو بگرن کە گەلانی ئەم وڵاتانە تەنها لەپێناو بەدەستهێنانی ئازادی و دادپەروەری و کەرامەتی مرۆڤەکانی ئەم گەلانەدا شۆڕش و ڕاپەڕینیان بەرپا کردووە، لەپێناو گەڕاندنەوەی سەروەریی گەلان لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان و چۆنێتیی دابەشکردنی سەروەت و سامانی گشتیی وڵاتەکانیان. شۆڕش و ڕاپەڕینەکانیان بۆ ئەوەیە کە گەلانی ئەم وڵاتانە خۆیان سەرچاوەی شەرعیەتی سیاسی بن و دەسەڵاتدارانیان دیاری بکەن و بتوانن چاودێرییان بکەن بەبێ هیچ جۆرە ترس و تۆقاندنێك.. شۆڕش و ڕاپەڕینەکانیان بۆ ئەوەیە کە دەوڵەت، دەوڵەتی یاسا و دەستەبەرکردنی مافەکان بێت بۆ هەموو هاووڵاتیان بەبێ هیچ جۆرە جیاوازییەك. هەر لەبەرئەوەشە هەموو چین و توێژەکان بە جیاوازی ئینتیمای نەتەوەیی و ئاینی و مەزهەبی و حیزبییەوە بە گشتی، بە تایبەتی توێژی لاوان و نەوەی نوێ، بەشدارن لە شۆڕشەکاندا و هیچ جۆرە مۆرکێکی ئایدۆلۆژی لە دروشمەکانیاندا بەدی ناکرێت.

لایەنە ئیسلامییەکان پێویستە بە جوانی دەرك بەم ڕاستییە بکەن کە گەل بۆیە متمانەیان پێ دەدات، چونکە بەشێك نەبوون لە ڕژێمە سیاسییەکان و خاوەنی قوربانیدانن دژ بە دەسەڵاتە دیکتاتۆرەکان و تێوەنەگلاون بە گەندەڵی و ستەمکاریی سیاسییەوە، لەوەش دڵنیابن کە سەرکەوتنیان لە ئەزموونی حوکمڕانیدا تەنها سەرکەوتن نییە بۆ خۆیان، بەڵکو سەرکەوتنە بۆ گەلانی ناوچەکە بەگشتی و داڕشتنەوەی سیستمی جیهانی و نێودەوڵەتی بە شێوەیەکی دادپەروەرانەتر و پێشکەوتووتر..

هەر لەبەرئەوەشە کە هەبوونی دید و ڕوئیای ڕۆشن و دروست لەبارەی ئامانجەکانی شۆڕش و ڕاپەڕینەکان و پرسی دەوڵەت و چۆنێتیی مومارەسەکردنی ئەزموونی حوکمڕانێتی، گەورەترین و گرنگترین (تحدی)یە لەبەردەم لایەنە

ئیسلامییەکاندا. لایەنە ئیسلامییەکان پێویستە چیتر لە مێژوودا نەژین و ڕۆڵەی سەردەمەکەی خۆیان بن و ئاین تێکەڵ بە مێژوو نەکەن، بە واتایەکی تر، مێژوو نەکەن بە بەشێك لە ئاین و بیانەوێت کۆپیی بکەنەوە بۆ ئەم سەردەمە. بەڵکو بە تێگەیشتنی ئامانجداری (الفهم المقاصدي) مامەڵە لەگەڵ پرسی دەوڵەت و پێداویستییەکانی قۆناغە مێژووییەکەدا بکەن، هاوسەنگی بکەن لەنێوان پاراستنی ناسنامەی ژیاریی و مەرجەعیەتی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە بەرهەمەکانی پێشکەوتنی فیکری ئینسانی لە بوارەکانی دەوڵەتداری و مەسەلە دەستووری و یاسایی و سیاسییەکاندا.. کاری جیددی بکەن بۆ هێنانەکایەی فیقهی پێکەوەژیان لەنێوان پێکهاتەکانی کۆمەڵگەکانی خۆیاندا لەسەر بنەمای هاوولاتیبوون لە ژێر چەتری دەوڵەتی مەدەنیدا کە لە سایەیدا ڕێز بگیرێت لە جیاوازییەکان و بەها و بنەما ئیسلامییەکانیش پارێزراوبێت.

## دەوڵەت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە

بە خوێندنەوەیەکی سەرتاپاگیر بۆ پەیامی پێغەمبەران و ئایینە ئاسمانییەکان بە گشتی و ئاینی ئیسلام بە تایبەتی، ئەو ڕاستییە دەردەکەوێت کە جەوهەر و ناوەرۆکی پەیامەکانیان بە دەوری دوو ئامانجی سەرەکی یان دوو تەوەری سەرەکیدا دەسوڕێنەوە:

**یەکەمیان:** پەیامی هیدایەت و ڕێنمایی کردنە بۆ یەکتاپەرستی و تەزکییەی ئەخلاقیی مرۆڤەکان و بەهێزکردنی لایەنی ڕۆحی و بەرزبوونەوە لە پلەکانی تەواوکاریی مەعنەوی و خواناسین و پەروەردەبوون و پێگەیاندنی کەسێتی مرۆڤی چاك و چاکەخوازو سوود بەخش بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی.

**دووەمیان:** دەستەبەرکردنی دادپەروەریی بۆ تێکڕای مرۆڤەکان و بەگژاچوونەوەی ستەمکاری و گەندەڵی بە هەموو شێوازەکانیەوە..

لێرەشەوە ئەو ڕاستییە ڕوون دەبێتەوە کە بەدیهێنانی دادپەروەری ئامانجێکی سەرەکیی پیرۆزی ئاینە و لە هەمان کاتدا ئەرکێکی ئاینی و شەرعیی گەورەیە کە ڕوودەکاتە هەڵگرانی پەیامی ئاینی بە گشتی و پەیامی ئیسلامی بە تایبەتی. بێگومان دەستەبەرکردنی ئەو دادپەروەرییەی کە ئاینی ئیسلام داوای دەکات، بەبێ دامەزراندنی سیستمێکی سیاسیی دروست و شیاو، نایەتەدی، چونکە لە هەموو حاڵەتێکدا ئەوە دەوڵەت و سیستمی سیاسییە کە مومارەسەی کاروباری گشتی دەکات. خاڵی بەیەکگەیشتنی ئاین و دەوڵەت یان ئیسلام و دەوڵەت لێرەوە دەستپێدەکات بۆ بەدەستهێنانی دادپەروەری لەناو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا.. پێشینان وتوویانە: (العدل أساس الملك) واتە دادپەروەری بنچینە و کۆڵەکەی دەوڵەت و دەسەڵاتە. قورئانی پیرۆز زۆر ڕاشکاوانە ئاماژە بەم مەسەلەیە دەکات کە دەفەرموێت: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ) (الحديد: ٢٥).

لەم ئایەتە قورئانییەدا ئاماژە بە چەند وشەیەکی گرنگ کراوە:

– (رُسُلَنَا) تێکڕای پێغەمبەران دەگرێتەوە.

– (الْبَيِّنَاتِ) پەیامی هیدایەت و ڕێنمایی بۆ یەکتا پەرستی و تەزکییەی ئەخلاقی و خودا پەرستن و هەر پێداویستییەکی تری ژیانی ڕۆحی و ئەخلاقیی مرۆڤەکان.

– (الْكِتَابَ) واتە پەیامی پێغەمبەران کە دواترینیان قورئانی پیرۆزە و ناوەرۆکی هەموویانی تێدا کۆکراوەتەوە.

– (الْمِيزَانَ) دیارە ئەوەش بەشێکە لەو پەیام و ڕێبازەی کە بۆ پێغەمبەران هاتووە و ئاماژەیە بەو پێوەر و بنەمایانەی کە مرۆڤ لە ژیانی تاک و کۆمەڵدا پێویستی پێیان دەبێت و دەتوانێت سوودیان لێ وەربگرێت.

- (النَّاسُ) كە تێکڕای مرۆڤەکان دەگرێتەوە، بەوانەی شوێن پێغەمبەران دەکەون یان هەر ڕێگایەکی تر دەگرنە بەر.

- (الْقِسْطِ) دادپەروەری بۆ سەرجەم مرۆڤەکان.

- (الْحَدِيدَ) وەك گرنگترین کانزا کە لە سەرتاسەری ژیانی مرۆڤایەتیدا تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت، هۆکاری سەرەکیی دروستکردنی ئامێر و ئامرازەکانی شارستانیەتە لە کۆن و نوێدا، لە هەردوو بواری بەرگریکردن و ئاوەدانکردنەوەدا (فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ).

کۆکردنەوەی ئەو (٧) حەوت چەمکە قورئانییە گرنگە لەیەك ئایەتدا، ئاماژە و حیکمەتی تایبەتی و گەورەی تێدایە و جۆرێك لە پێکەوە گونجان و بەزاندنی سنوورەکان و شوێن و کات (جوگرافیا و مێژوو)ی تێدا ڕەچاو کراوە. هەروەك مادەی (ئاسن) بەدرێژایی مێژوو بە پانتایی جوگرافیای زەوی پێویستە بۆ ژیان و ئاوەدانکردنەوەی زەوی و لە هەر سەردەم و هەلومەرجێکدا، مرۆڤ ئامێر و تەکنۆلۆژیای پێویستی لێ دروستکردووە. بە هەمان شێوە دادپەروەری (الْقِسْطِ) پێویستییەکی سەرەکیی ژیانی کۆمەڵایەتییە بۆ مرۆڤەکان و خوای گەورە پێوەر و بنەما گرنگەکانی (الْمِيزَانَ)ی بۆ دەستنیشانکردوون و مرۆڤەکان خۆیان دەتوانن بە ئیلهام وەرگرتن لە پەیامی پێغەمبەران، لە هەر سەردەم و قۆناغێکی مێژوویيدا دەزگا و دامەزراوەی پێویست و سیستەمی سیاسیی گونجاو بهێننە کایەوە، گرنگ ئەوەیە کە دادپەروەری بۆ سەرجەم مرۆڤەکان (النَّاسُ)ی پێ بێتە دی. هەر لەبەر ئەوەشە کە لە ئیسلامدا شێوە و شێوازی دیاریکراو بۆ دەوڵەت و سیستەمی سیاسی دیاری نەکراوە، بەڵکو تەنها بنەماکانی دەستنیشانکردووە کە گرنگترینیان بریتییە لە ڕەزامەندیی میللەت و بەدیهێنانی عەدالەت. چونکە وەزیفەی سەرەکی و ئامانجی بنەڕەتیی دەوڵەت بریتییە لە بەدیهێنانی دادپەروەری وەك گرنگترین و پێویستترین پێوەر و بنەمای سەرکەوتن و سەقامگیریی سیستەمی سیاسی. ئەوەتا زانای ناوداری موسڵمانان (ابن تيمية)

لەوبارەیەوە وتەیەکی مەشهوری هەیە کە دەڵێت: (ان الله یقیم الدولة العادلة ولو کانت کافرة ولا یقیم الدولة الظالمة وان کانت مسلمة). گرنگیی دادپەروەری لە میزانی ئیسلام و گوتاری قورئانیدا لە ئاستێکدایە کە قورئان کافربوون و دژایەتیکردنی بەڵگەکانی خوا و کوشتنی پێغەمبەران بە ناهەق و کوشتنی ئەو کەسانەی کە داوای دادپەروەری و چاکسازیی ڕاستەقینە دەکەن، با سەر بە هەر ئاین و باوەڕێکی تریش بن، خوای گەورە وەك یەك تەماشایان دەکات و سزای توندی بۆ ئامادەکردوون. ئەوەتا قورئانی پیرۆز ڕاشکاوانە ئەم ڕاستییە ڕادەگەیەنێت: (إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَيَقْتُلُونَ النَّبِيِّينَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَيَقْتُلُونَ الَّذِينَ يَأْمُرُونَ بِالْقِسْطِ مِنَ النَّاسِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ) (آل عمران: ٢١).

لەو ڕوانگەیەوە پێغەمبەری ئیسلام (درووودی خوای لەسەر بێت) ڕاستە کار و ئەرکی سەرەکیی پێغەمبەرایەتییەکەی بایەخدان بووە بە پەیامی هیدایەت و ڕێنماییکردنی مرۆڤەکان و پەروەردەکردنیان بۆ خواناسین و ئامادەکردنیان بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگە و مرۆڤایەتی، بەڵام ئەوەش حەقیقەتە کە هاوزەمان لەگەڵ ئەوەشدا، بە تایبەتی دوای کۆچکردنی بۆ شاری مەدینە، کاری گرنگی کردووە بۆ دەستەبەرکردنی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و ڕێکخستنی کاروباری گشتیی شارەکە و دەوروبەری، بە تێکڕای دانیشتوانەکەیەوە، بە جیاوازیی ئینتیمای ئاینی و ناوچەیی و تیرە و هۆزەکانیانەوە. چونکە مەعلومە کە چەند هۆزێکی جولەکە لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بوون و لەسەر بنەمای (پەیمانێکی کۆمەڵایەتی) هاوشێوەی دەستوور و بەڵگەنامە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم ڕۆژگارە، کە بە (صحیفة المدینة) بەناوبانگە، پەیوەندیی نێوان هەموو لایەك و ئەرك و ڕۆڵیانی لە پاراستنی ناوچەکەدا تێدا دیاری کرد. لە دواڕۆژەکانی ژیانیشیدا هیچ کەسێکی دەستنیشان نەکرد بۆ جێنشینی خۆی، چونکە ئەو خۆی وەك پێغەمبەر و خاوەنی پەیامی ئاسمانی، دوا پێغەمبەر بووە و دوا پەیامی ئاسمانیی هێناوە، دوای ئەو کەسێکی تر لەو بوارەدا ناتوانێت و ناکرێت جێگای بگرێتەوە. ئەوەش کە پەیوەندیی بە

درێژەدان بە ژیانی گشتی و کاروباری سیاسیی موسڵمانەکان و کۆمەڵگەکەیانەوە بووە، ئەوە (الکتاب والمیزان) کە قورئان و سوننەتە، بۆی جێهێشتوون، واتە قورئان و ئەو ڕێباز و مەنهەجیەتەی کە بۆی ڕەسمکردوون و پێویستە لەسەری بڕۆن. گرنگ ئەوەیە کە ئەو دوو مەرجەی تێدا ڕەچاو کرابێت: **یەکەمیان** مەرجەعیەتی ئیسلام کە قورئان (الکتاب) و **دووەمیان** ڕەچاوکردنی ئەو بنەمایانەی کە دادپەروەری (القسط) بۆ سەرجەم مرۆڤەکان (الناس) بهێنێتە دی. دیارە کە لە هەر سەردەم و قۆناغێکی مێژووییدا شێوە و شێواز و دامەزراوەی نوێ و جیاواز دەخوازێت. چۆنێتیی دیاریکردنی خەلیفەکانی ڕاشیدین لەو ڕوانگەیەوە ئەنجامدراوە، ئەوە بوو کە بە ڕەزامەندیی موسڵمانەکانی مەدینە و دەوروبەری، کە نوخبەکەیان بریتی بوون لە (موهاجیرین و ئەنسار) جێگای متمانەی سەرجەم موسڵمانان بوون، ئەوان متمانەیان بە هەرکەس بدایە و لەسەر هەرکەسێك ڕێکبکەوتنایە، هەموان پێی ڕازی دەبوون. بۆیە دەتوانین بڵێین دیاریکردنی هەرچوار خەلیفەکەی ڕاشیدین لەسەر بنەمای ڕەزامەندیی موسڵمانان شەرعیەتی سیاسی و دەسەڵاتیان وەرگرتووە. چونکە قورئانی پیرۆز ڕاشکاوانە جەخت لەسەر ئەو مەسەلە دەکاتەوە کە (وامرهم شورى بينهم) ئاماژەیە بۆ کاروباری گشتی و سیاسی کۆمەڵگە موسڵمانەکان، کە پێویستە بە شوورا و ڕەزامەندیی تێکڕای گەل بێت.

کەواتە ئەرکی بەئەنجام گەیاندنی هەردوو ئامانجە سەرەکییەکەی پەیامی ئیسلام، کە پەیامی هیدایەت و پەیامی دادپەروەرییە، کۆمەڵگەی موسڵمان بە گشتی لێی بەرپرسیارە و کۆمەڵگەی موسڵمان بە زانایان و نوخبە و ئەندامەکانی و بە دامەزراوە ئەهلییەکانەوە، بەرپرسیارن لە پاراستنی بەها و دروشمە ئاینییەکان و ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگە. هەر کۆمەڵگە خۆیشی سەرچاوەی پێدانی شەرعیەتی سیاسییە بە دەسەڵاتداران و دامەزراوەی دەوڵەت و سیستەمی سیاسیی وڵات و چاودێریکردن و لێ پرسینەوەی دەسەڵاتداران.

کۆمەڵگە و نەتەوەی موسڵمان تێکڕا، بەرپرسیارێتیی ڕاستەقینە هەڵدەگرن، چونکە گوتاری قورئانی بە شێوەیەکی گشتی ڕوو لە تێکڕای موسڵمانان دەکات و بەردەوام بە شێوازی کۆ (صيغة الجمع) بانگەشەیان دەکات و دەستەواژەی (يا أيها الذين آمنوا، يا أيها الناس..) دەیان جار لە قورئاندا دووپاتبووەتەوە، بەڵگەیەلەسەرئەوەی کە گوتاری قورئانی ڕووی لە کەسێك یان گرووپێك یان دەزگایەکی دیاری کراو نەکردووە و ئاماژەیە بۆ ئەو ڕاستییەی کە لە ئیسلامدا مەرکەزیەت بۆ دەوڵەت و سیستمی سیاسی نییە، بەڵکو مەرکەزیەت و مەرجەعیەت بۆ گەل و نەتەوەیە، یان (ئوممەت) بە مفهومی ئیسلامی.

## شەرعیەتی سیاسی پێش سیاسەتی شەرعی

وەك ئاماژەمان پێدا، لە ئیسلامدا شێوە و شێوازێکی دیاریکراو بۆ دەوڵەت و سیستمی سیاسی نییە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە ڕەزامەندیی میللەتی لەسەر بێت و بتوانێت دادپەروەری بهێنێتەدی. بۆ هێنانە دیی ئەو ئامانجەی سەرەوە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە دەوڵەت لەسەر دوو بنەمای سەرەکی دادەمەزرێت:

**یەکەمیان:** داننان بە مەرجەعیەتی ئیسلامی، وەك سەرچاوەی باڵای یاسادانان.

**دووەمیان:** پابەندبوون بە شوورا، واتە ڕەزامەندیی گەل وەك سەرچاوەی شەرعیەتی سیاسی.

بەوپێیە ئوممەت (گەل، نەتەوە، کۆمەڵگەی سیاسی) سەرچاوەی شەرعیەتە بۆ دەوڵەت و حکومەت.. ئەوەش مانای ئەوەیە کە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە سەروەریی سیاسی دەگەڕێتەوە بۆ گەل و کۆمەڵگەی سیاسی.

کێشەی سەرەکیی دەوڵەت لە سەرتاسەری مێژووی ئیسلامیدا و تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت، دەگەڕێتەوە بۆ وەلانانی بنەمای دووەم، واتە سەروەریی گەل لە پێدانی شەرعیەتی سیاسی بە دەسەلات و کەسانی فەرمانڕەوا.

هەرچی ڕووکنی یەکەمیشە (مەرجەعیەتی ئیسلامی لە یاسادانان)دا، کورتکراوەتەوە لە جێبەجێکردنی سزاکان (الحدود) و پۆشاکی ئافرەت و هەندێ وردە مەسەلەی تری ڕواڵەتی. ئیتر ئامانجە شەرعییەکانی ئیسلام لە هێنانەدیی دادپەروەری و یەکسانی لەنێوان مرۆڤەکان و ئاوەدانکردنەوەی وڵات و ڕێزگرتن لە کەرامەتی مرۆڤ و پاراستنی سەر و ماڵیان و خۆشگوزەرانکردنیان لە سایەی سیستمێکی سیاسیی عادیلانەدا... هەموو ئەو ئامانجە گرنگ و ژیارییانە هەر هەمووی خراونەتە پشتگوێ. ئەم حاڵەتە لەدوای چوار خەلیفەکەی ڕاشدین دەستی پێکردووەو بە درێژایی مێژووی دەوڵەتەکانی ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی و تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت، بە شێوازی جیاجیا بەردەوامە.

لەو سۆنگەیەوە چەمکی (سیاسەتی شەرعی) جێگای چەمکی (شەرعیەتی سیاسی)ی گرتەوە... سیاسەتی شەرعی چەمکێکی فیقهی مێژووییە، لەلایەن زانایان و فەقیهەکانەوە هێنرایە کایەوە بۆ گونجاندن و بەراوردکاری کردنی هەڵسوکەوت و چۆنێتیی مامەڵەکردنی خەلیفەکان و حوکمڕانە موسڵمانەکان لەڕوانگەی بنەما و بەها ئیسلامی و شەرعییەکانەوە، لە سایەی ئەو سیستمە سیاسییە ستەمکارییە تاکڕەوییەی کە لەدوای سەردەمی ڕاشدین هاتە کایەوە. دوای ئەوەی زانایان و پێشەوایانی ئاینی نائومێد بوون لە ڕاستکردنەوەی سیستمی خەلافەت و گەڕاندنەوەی بۆ سەر ڕێچکەی خۆی لەسەر بنەمای شوورا و ڕەزامەندیی ئوممەت، بە ناچاری کۆڵیان دا لە دژایەتیکردنی دەسەڵاتداران و پشتگیریکردنی شۆڕشەکان. بەڵکو بەوەشەوە نەوەستان، ئەوەبوو هەر جۆرە شۆڕش و هەڵسانێکی چەکدارانەیان ناوزەد کرد بە (الفتنة)، واتە ئاژاوەگێڕی. لەو سۆنگەیەشەوە پاساوی شەرعی درایە دەست خەلیفەکان بۆ سەرکوتکردنی

شۆڕشەکان و شۆڕشگێڕان بە توندترین شێوازی بەکارهێنانی هێز و داپڵۆسین و زەبروزەنگ. کەواتە چەمکی سیاسەتی شەرعی گوزارشتە لە چەمکی مەشروعیەت، واتە هەڵسوکەوت (تصرفات واجراءات)ی دەسەڵاتی سیاسی، پێویستە بە گوێرەی یاسا یان بە گوێرەی شەریعەت بێت.

هەرچی چەمکی (شەرعیەتی سیاسی)یە زاراوەیەکی شەرعی و دەستوورییە و گوزارشتە لە چەمکی شەرعیەت. مەبەست لێی گونجاندن و ڕاستکردنەوەی سیستمی سیاسی و دەسەڵاتە لەگەڵ داخوازییەکانی بنەما و بەها ئیسلامییەکاندا لە بواری سیاسیدا، کە سەرەکیترینیان بریتییە لە شوورا و ڕەزامەندیی ئوممەت، کە بە تەعبیری ئەم سەردەمە، بریتییە لە بنەمای سەروەریی سیاسیی گەل.

ئەو ڕاستییە نەخوازراوە، واتە لەدەستدانی شەرعیەتی سیاسی بۆ خەلیفەکان و دەسەڵاتی سیاسی لە مێژووی دەوڵەتی ئیسلامیدا، لە زۆر ڕووداو و چەندین هەڵوێستی ڕێبەران و زانایانی گەورەدا دەردەکەوێت. شۆڕشەکانی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر و حسەینی کوڕی ئیمامی عەلی، ئامانجی سەرەکییان گەڕاندنەوەی شەرعیەتی سیاسیی خەلافەت بوو بۆ کۆی موسڵمانان و ئەو ڕێبازەی خەلیفەکانی ڕاشدین لەسەری دەڕۆیشتن. هەروەك هەڵوێستی زانایانی پایەبەرزی وەك (ئیمامی ئەبو حەنیفە) کە بە گەورەترین پێشەوایانی چوار مەزهەبە سەرەکییەکەی ئەهلی سوننەت دادەنرێت، کاتێك خەلیفەی عەباسی (ابو جعفر المنصور) داوای لێ دەکات پۆستی سەرۆکی دادوەران (قاضي القضاة) وەربگرێت، داواکەی ڕەتدەکاتەوە و لەو پێناوەدا دووچاری زیندانیکردن و ئەشکەنجە دەبێتەوە. کاتێك هاوڕێ و دۆستەکانی داوای لێ دەکەن داواکارییەکەی خەلیفەی عەباسی ڕەتنەکاتەوە.. لە وەڵامدا دەڵێت: ئەو داوام لێ بکات تەنانەت دەرگاکانی کۆشکەکەشی بۆ بژمێرم، قبوڵی ناکەم، چونکە هەر لە سەرەتاوە بڕوام بە شەرعیەتی حوکمڕانییەکەی نییە، ئیتر چۆن ئەو پۆستە باڵایەی لێ قبوڵ بکەم. چونکە قبوڵکردنی ئەو پۆستە بۆ زانایەکی وەك ئیمام ئەبو حەنیفە مانای شەرعیەتدان بوو بە دەسەڵاتی

عەبباسییەکان، کە لە ڕاستیدا بە زەبری هێز دەسەڵاتیان گرتبووە دەست نەك لەسەر بنەمای شوورا و ڕەزامەندیی ئومەت. مانای وایە کێشەی سەرەکیی دەسەڵاتی سیاسی لە سەردەمی ئەمەوییەکان و عەباسییەکاندا، نەبوونی شەرعیەتی سیاسی بووە، بەڵام لەژێر سیاسەتی داپڵۆسینی بێڕەحمانەی خەلیفەکان و سەرنەکەوتنی شۆڕشە یەك لەدوای یەکەکاندا، بە مەبەستی پاراستنی سەقامگیریی وڵات و یەکلابوونەوەی وزە و تواناکانی میللەت لەپێناوی ئاوەدانکردنەوەی وڵات و چاککردنی باری گوزەرانی خەڵکەکەدا، زانایان و زۆرینەی میللەت بە ناچاری چاوپۆشییان لە شەرعیەتی سیاسی کرد و خۆیان گونجان لەگەڵ سیستمی پاشایەتی و تاکڕەوی و دیکتاتۆرییەتدا.

لە سەرەتاوە شەرعیەتی سیاسی پشتگوێ خراو چاوپۆشیی لێ کرا، سەرەنجام سیاسەتی شەرعیش هیچ ڕۆڵ و کاریگەرییەکی بۆ نەمایەوە. بەڵکو ستەمکاریی سیاسی و گەندەڵی و دواکەوتن و هەژاری و نەزانین، سەرتاپای وڵاتانی ئیسلامیی گرتەوە، کە تا ئەمڕۆش بە داخەوە هەر بەردەوامە. هۆکاری سەرەکی و ئامانجی گەورەی شۆڕش و ڕاپەڕینەکان بۆ کۆتایی هێنانە بەو کولتوورە نادروستە و گەڕاندنەوەی سەروەریی سیاسییە بۆ گەلانی ناوچەکە و ئەوەش دەبێتە دەستپێکی پرۆسەی چاکسازیی ڕیشەیی لەم وڵاتانەدا.

## چەمکی شەریعەت و چەمکی جێبەجێکردنی شەریعەت

هەرکاتێك باس لە دەوڵەتی ئیسلامی بکرێ، یان باس لەوە بکرێت کە ڕەوتی ئیسلامی و لایەنە ئیسلامییەکان دێنە سەر حوکم، ڕاستەوخۆ مەسەلەی حوکمکردن بە شەریعەت و جێبەجێکردنی شەریعەت دەبێتە جێگای مشتومڕ و تێڕوانینی جیاجیا و سەرهەڵدانی چەندین کێشە و گرفت و دڵەڕاوکێ لای بەشێکی کۆمەڵگە و نوخبە عەلمانییەکان بە تایبەتی.

ڕاسته کۆڵەکەی یەکەمی دەوڵەت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بریتییە لە دانانان بە سەروەریی شەریعەت لە بواری یاسادانان‌دا، بەڵام لە ڕووی پراکتیکییەوە ئەم مەسەلەیە ئەمڕۆ بووەتە هۆی دروستبوونی کێشەیەکی فیکری و ڕۆشنبیری و سیاسی لەنێوان ڕەوتە ئیسلامی و عەلمانییەکاندا. هۆکارەکەشی بە ڕای (دکتور احمد الريسوني)[١٦] کە زانایەکی ئیسلامیی هاوچەرخە لە (فیقهی مقاصدی) دا، دەگەڕێتەوە بۆ تێکەڵکردنێکی نادروست لەنێوان چەمکی شەریعەت و چەمکی جێبەجێکردنی شەریعەتدا. هەر ئەم تێکەڵکردنەشە بووەتە هۆی دروستبوونی کێشە و گرفتی فیکری و سیاسی، کە دەکرێ، بەڵکو پێویستە چارەسەر بکرێت، بە تێگەیشتنی ڕاست و دروست لە هەردوو چەمکەکە.

سەرچاوەی سەرەکیی ئەم تێکەڵکردن و خراپ تێگەیشتنە لە چەمکی جێبەجێکردنی شەریعەتدا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دید و بۆچوونەی کە لە گوتاری ئیسلامی و ئاینیی بەشێك لە زانایانی ئاینی و لە لایەنە ئیسلامییە ئاراستە سەلەفییەکاندا ڕەنگی داوەتەوە، کە تێکەڵ بووە لەگەڵ کولتوور و ڕۆشنبیریی کۆمەڵگە موسڵمانەکان. لەو ڕوانگەیەوە ئەو مەسەلە گرنگە، واتە (جێبەجێکردنی شەریعەت)، بە داخەوە کورتکراوەتەوە لە یاسای سزاکان و پۆشاکی ئافرەت و هەندێ دیاردەی تری ڕواڵەتی، لەسەر حسابی ئامانجە گەورەکانی شەریعەت کە پەیوەستن بە پاراستنی ماف و کەرامەتی مرۆڤەکان و دابینکردنی یەکسانی و دادپەروەری و بەگژاچوونەوەی ستەم و ناڕەوایی و ئاوەدانکردنەوەی وڵات و پێشکەشکردنی نموونەی شارستانییانە و پێشکەوتوو لە هەموو ڕوویەکی ژیانەوە، بە تایبەتی لە بواری حوکمڕانیکردن و بەدیهێنانی دادپەروەریدا.

---

[١٦] عبدالله المالكي، سيادة الامة قبل تطبيق الشريعة، ط١، الشبكة العربية للابحاث والنشر، بيروت، ٢٠١٢، ص٢٩.

لەو تێڕوانینە بەرتەسکەوە، ئەگەر دەوڵەتێك یان سیستمێکی سیاسی هەندێ لە سزا شەرعییەکانی جێبەجێ کرد بەسەر کەسانێکی کەم دەسەڵات و بێچارەدا، یان ئافرەتی ناچار کرد بە پۆشینی جۆرێکی دیاریکراو لە پۆشاك، یان فشار و ڕێگریی کرد لە هەندێ هەڵسوکەوت لەسەر ئاستی تاکەکانی کۆمەڵگە، ئیتر ئەو دەوڵەتە شەریعەتی جێبەجێ کردووە و بە دەوڵەتێکی ئیسلامی دەدرێتە قەڵەم و نابێت هیچ جۆرە ڕەخنە و ناڕەزایەتییەکی لەبەرامبەردا بکرێ، تەنانەت ئەگەر- کە بەداخەوە زۆرجاریش وایە- دەسەڵاتێکی ستەمکار و گەندەڵ بێت و هیچ حسابێك بۆ دابینکردنی یەکسانی و دادپەروەری و پاراستنی سەر و ماڵ و کەرامەتی هاووڵاتیان نەکات و مافەکانیان پێشێل بکات و لە زۆربەی بوارەکانی تری ژیاندا وڵات لە حاڵەتی دواکەوتن و هەژاری و نەزانیندا بێت.

بە پێچەوانەشەوە ئەگەر دەوڵەتێك و دەسەڵاتێکی سیاسی بتوانێت دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و ئازادییەکان و یەکسانی لە ماف و ئەرکەکاندا بۆ سەرجەم هاووڵاتیان دەستەبەر بکات، بەبێ هیچ جیاوازییەکی ئاینی و ڕەگەزی و تایفی و سیاسی، یاسا سەروەر بێت و لە سەروو هەموانەوە بێت، تایبەتمەندێتییەکانی ئەندامانی کۆمەڵگە پارێزراو بێت، دەسەڵاتە سیاسییەکە دەسەڵاتێکی هەڵبژێردراو بێت و هیچ بەرپرسێك یان دەسەڵاتدارێك نەتوانێت لە لێپرسینەوە و یاسا دەرباز ببێت، وڵات ئاوەدان و پێشکەوتوو بێت، ئاین و ئاینداری ئازاد و ڕێزلێگیراو بێت بۆ هەموان، ئاستێکی باش لەڕێز و کەرامەت و خۆشگوزەرانی بۆ تێکڕای هاووڵاتیان دەستەبەر کرابێت. بەڵام لەسایەی ئەو دەوڵەتەدا یاسای سزاکان (العقوبات والحدود)ی ئیسلامی جێبەجێ نەکرێت و ئافرەت ناچار نەکرێت بە پۆشینی شێوازێکی دیاریکراو لە بەرگ و پۆشاك. ئەو دەوڵەتە لە دیدی بەشێکی زۆر لە ئیسلامییەکانەوە، بە داخەوە، بە دەوڵەتی ئیسلامی و جێبەجێکاری شەریعەت لە قەڵەم نادرێت. هۆکاری سەرەکیی ئەم دید و تێڕوانینە نادروست و ناڕاستە، وەك وتمان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تێڕوانین و

تێکەڵکردنەی کە لە دید و تێگەیشتنی زۆرێك لە موسڵماناندا بە شێوەیەکی نادروست چەسپیوە لەبارەی چەمکی شەریعەت و چەمکی جێبەجێکردنی شەریعەتەوە.

لەڕاستیدا چەمکی شەریعەت بە تەنها ئەحکامە شەرعییەکان و تەکالیفە عەمەلییەکان ناگرێتەوە، بەڵکو هەموو ئیسلام دەگرێتەوە بە (عەقائید و عیبادات و معامەلات) و تێکڕای تەکالیفە شەرعییەکان. بەو پێیە چەمکی شەریعەت مەودایەکی فراوانتری هەیە بە ئەندازەی هەموو ئیسلام بە قورئان و سوننەت و هەموو دروشمە ئیسلامییەکانەوە. موسڵمانان پێویستە لەسەریان ئیمان و بڕوای تەواویان پێی هەبێ و هەوڵ بدەن لە ژیانی تاك و کۆمەڵدا بەپێی توانا جێبەجێی بکەن.

لەم حاڵەتەدا شەریعەت زۆر لەوە فراوانتر و گشتگیرترە تابتوانین کارپێکردنی یان کار پێنەکردنی پەیوەست بکەین بە دەوڵەت و دەسەڵاتی سیاسییەوە، یان بەو لایەنەی کە دەسەڵاتی سیاسی دەگرێتە دەست، چونکە لەم حاڵەتەدا کۆمەڵگەی موسڵمان بە گشتی خاوەنی ئیسلام و شەریعەتە و بەرپرسیارە لە جێبەجێکردنی شەریعەت، لە ڕێگای پابەند بوون بە خواستەکانی شەریعەتەوە لەسەر ئاستی تاك و خێزان و کۆمەڵگە، لە بوارەکانی ژیاندا، لە ڕێگای زانایان و مزگەوت و تێکڕای دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی تریەوە. دەوڵەت یان دەسەڵاتی سیاسی، یەکسان نییە بە گەل یان بە کۆمەڵگە، بەڵکو بەشێکە لە کۆمەڵگە و بەشێك لە ئەرکی جێبەجێکردنی ئیسلام و شەریعەت ڕووی تێدەکات، نەك هەموو ئیسلام و هەموو شەریعەت.

ئەوە کۆمەڵگەی موسڵمانە کە دەوڵەت و دەسەڵاتی سیاسی دێنێتە بەرهەم، نەك بە پێچەوانەوە. ئەگەرچی دەوڵەت یان دەسەڵاتی سیاسی لەتوانایدایە و ئەتوانێت ڕۆڵی ئیجابی یان سەلبی هەبێ لەئامادەکردنی کەشو هەوای گونجاو یان

نەگونجاو بۆ کۆمەڵگە بۆئەوەی بە ئازادی و بە خواستی خۆی تەعبیر لەناسنامەو بەهاو ڕەوشت و بەرژەوەندیەکانی و ئامانجە ڕەواکانی بکات.

ئەگەر لەم ڕوانگەیەوە سەرنج بدەین، دەبینین جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان چەمکی (شەریعەت) و چەمکی (جێبەجێکردنی شەریعەت)دا [(١٧)]: چونکە شەریعەت لەڕاستیدا بریتییە لە (دین)، کە سروشی خوایی (الوحي الالهي) و کرداری خواییەوە و (معصوم ومقدس)ـە و سنوورەکانی کات و شوێن (الزمان والمکان) نایگرێتەوە و ملکەچ نابێت بۆ هەلومەرج و کۆت و پێوەندەکانی مێژوو. بەڵام چەمکی (جێبەجێکردنی شەریعەت– تطبیق الشریعة)، کرداری مرۆڤە و ئیجتیهادێکی مێژووییە و (معصوم و مقدس) نییە و بەستراوە بە هەلومەرج و کۆت و پێوەندەکانی کات و شوێنەوە، هاوشان نابێت لەگەڵ کۆی شەریعەت، کە دینی خوایە. بەڵکو بەرهەمی عەقڵ و لێزانین و توانای مرۆڤەکانە لە هەلومەرجێکی دیاریکراودا و ڕەنگە هەندێ جار بە شێوەیەکی نادروست جێبەجێ بکرێت و پێچەوانە بێت لەگەڵ ئامانجەکانی شەریعەتدا. کەواتە جێبەجێکردنی شەریعەت یەکسان نییە بە شەریعەت و قبوڵکردن یان ڕەتکردنەوەی جێبەجێکردنی شەریعەت (بەو تێڕوانینە نادروستە) یەکسان نابێت بە قبوڵکردن یان ڕەتکردنەوەی شەریعەت. لێرەدا پێویستە ئەو ڕاستییە لە بەرچاوبگرین کە خواستی کۆمەڵگە موسڵمانەکان و مەبەستیان لە جێبەجێکردنی شەریعەت، بریتی نییە لە سەپاندنی هەندێ کۆت و پێوەندی فیقهی بەسەر کۆمەڵگەدا، بەڵکو کاتێك باس لە جێبەجێکردنی شەریعەت دەکرێت، مەبەست لێی بەرپابوونی دادپەروەری و یەکسانی و ڕێزگرتنی تەواوە لە سەرجەم تاکەکانی کۆمەڵگە و خاکیبوونی دەسەڵاتداران وکەمکردنەوەی جیاوازییەکانە لەنێوان دەسەڵاتداران و هاووڵاتیاندا.

---

[١٧] نفس المصدر، ص٥٦.

چونکە لە هەست و نەستی کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا ئەو مەسەلانە چەسپیوە لەبارەی ژیانی خەلیفەکانی ڕاشیدینەوە.

هەر لەم دیدگایەوە وەك چۆن لە بواری دیاریکردنی سیستەمی سیاسیی وڵات و هەڵبژاردنی دەسەڵاتداراندا گەل یان نەتەوە (الأمة) خاوەنی مەرجەعیەتە و مافی شەرعیەت پێدانی هەیە و پێویستە بە ڕەزامەندیی گەل بێت... بە هەمان شێوە لە بواری چۆنێتیی حوکمڕانی کردن بە شەریعەت و چۆنێتی جێبەجێکردنی شەریعەتدا، ئەوە کۆمەڵگەی موسڵمانە بە هەموو ئاراستە و پێکهاتەکانیەوە، کە خاوەنی سەروەریی ڕاستەقینەیەو مافی بڕیاردانی هەیە لەسەر چۆنێتیی دابەزاندنی ئەو مەسەلەیە، دیارە لەڕێگەی نوێنەرە ڕاستە قینەکانی و دامەزراوە دەستووری و شەرعییەکانیەوە. هیچ لایەن و دەسەڵاتێکی سیاسی بۆی نییە ئەو مەسەلەیەی بەسەردا بسەپێنێت، چونکە ئەم مەسەلەیە یەکێکە لەو مەسەلانەی کە ئاستێکی باش لە سازانی کۆمەڵایەتی و کۆدەنگیی نیشتیمانی دەخوازێت، بۆ ڕێگرتن لە ئەگەری پەرتەوازەبوونی کۆمەڵگە و تێکچوونی باری سەقامگیری و ئاشتیی کۆمەڵایەتی.

## دەوڵەت لە ئیسلامدا مەدەنییە نەوەك دینی

بە تێڕامان لە دەقەکانی قورئان و سوننەت لەبارەی دەوڵەت و سیستەمی سیاسی و واقیعی مێژوویی چۆنێتی مومارەسەکردنی دەسەڵات لە لایەن خودی پێغەمبەری ئیسلام (درووود و سەلامی خوای لەسەر) و پاشان خەلیفەکانی ڕاشیدین، ئەو ڕاستییە ڕۆشن دەبێتەوە کە دەوڵەت لە ئیسلامدا پێویستییەکی ژیانی کۆمەڵایەتییە و لە لایەن گەل یان کۆمەڵگەوە بەرهەمدەهێنرێت و ڕێوشوێنی بۆ دیاری دەکرێت. ئەو دوو ڕووکنەش کە ئاینی ئیسلام دیاریی کردوون بۆ دامەزراندنی دەوڵەت (واتە مەرجەعیەتی ئیسلام و ڕەزامەندیی ئوممەت) تەئکید

لەسەر هەمان ئامانج دەکەنەوە. چونکە لەم سەردەمەدا مەسەلەی سەروەریی شەریعەت یان مەرجەعیەتی ئیسلامی لە یاساداناندا، ئەوە یەکلابووەتەوە و لە دەستووری وڵاتانی ئیسلامیدا بە شێوەیەکی گشتی دان بەو مەسەلەیەدا نراوە و بووەتە خاڵێکی هاوبەشی نێوان هەموو لایەك. هەرچی ڕووکنی دووەمیشە کە بریتییە لە شوورا و ڕەزامەندیی گەل، ئەوەش دیارە کە لە مێژووی دەوڵەتی ئیسلامیدا نەك هەر نەتوانراوە ئالیەت و ڕێوشوێنی دامەزراوەیی بۆ دابهێنرێت، بەڵکو بەداخەوە سیستمی سیاسی گۆڕا بۆ سیستمی پاشایەتی و ئیستیبدادی و هەموو دەسەڵاتەکان لە کەسی خەلیفە یان سوڵتاندا، کۆبووبووەوە.

دەوڵەت و دەسەڵاتی سیاسی لە ئیسلامدا لەسەر بنەمای ڕەزامەندیی گەل و بەرپرسیاریی دەسەڵاتدار بەرامبەر بە گەل دادەمەزرێت. سەرۆکی دەوڵەت وەکیلی خوا نییە و نوێنەرایەتیی خواناکات لە زەویدا، بەڵکو وەکیلی خەڵکە و نوێنەرایەتی خەڵك دەکات و لە لایەن ئەوانەوە هەڵدەبژێردرێت و خەڵك مافی چاودێریکردن و لێپرسینەوە و لابردنیشی هەیە. هەر لەو ڕوانگەیەوە یەکەم خەلیفەی ڕاشیدین (ابوبکر الصدیق) لە یەکەم وتاریدا دوای هەڵبژاردنی بە خەلیفە، ئەو ڕاستییەی ڕاگەیاند کە وتی: (لقد وليت عليكم ولست بخيركم...فإن احسنت فأعينوني وإن أسات فقوموني..)، میکانیزم و شێوازەکانی دیاریکردنی سەرۆکی دەوڵەت لە لایەن خەڵکەوە دیاری دەکرێت و لە ڕێگای نوێنەرەکانیانەوە، بۆئەوەی باشترین ئاست لە ڕەزامەندیی گەل و دادپەروەری و بەرژەوەندییەکانی وڵات دەسەتەبەر بکرێت. لەو وتارە گرنگەی خەلیفەی یەکەمدا ڕاشکاوانە بنەما سەرەکییەکانی دەوڵەتی مەدەنی و دیموکراسی دانی پێدا نراوە و بە شێوەیەکی پراکتیکیش خۆی و خەلیفەکانی تری ڕاشدین لەسەری ڕۆشتوون، کە بریتییە لەم بنەمایانە [(١٨)]:

[١٨] د. حاكم المطيري، تحرير الانسان وتجريد الطغيان، دراسة في أصول الخطاب السياسي القرآني والنبوي والراشدي، الجزء الثانی، ص٤٠٤.

**یەکەم**: بنەمای هەڵبژاردنی سەرۆکی وڵات لە لایەن گەل یان نوێنەرەکانیەوە (لقد وليت عليكم ولست بخيركم).

**دووەم**: بنەمای چاودێریکردنی دەسەڵات لە لایەن گەلەوە: (فإن أحسنت فأعينوني وإن أسأت فقوموني...).

**سێیەم**: بنەمای مەشروعیەت، سەروەریی یاسا، واتە هەڵسوکەوت و کاروبارەکانی دەسەڵاتداران پێویستە بەپێی یاسا و دەستوری وڵات بێت، کە لە ئیسلامدا شەریعەتی ئیسلامی سەرچاوەکەیەتی (أطيعوني ما أطعت الله فيكم، فإن عصيت فلا طاعة لمخلوق في معصية الخالق).

بەوشێوەیە خەلیفەی یەکەم و خەلیفەکانی تری ڕاشیدین، دوای خۆیان تێکڕای تیۆرەکانی تری دامەزراندنی دەسەڵاتی سیاسییان پوچەڵکردەوە، وەك: تیۆری هێز و زاڵبوون و دەستبەسەراگرتن، یان تیۆری مافی خوایەتی یان پێ سپاردن لە لایەن خواوە، بەو شێوەی کە پیاوانی کڵێسا لە ڕۆژئاوا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا خۆیان فەرمانڕەواییان دەکرد بە ناوی خواوە، وەیان شەرعیەتیان بە هەر پادشایەك بدایە کە خۆیان بیانویستایە. هەروەها تیۆری میراتی و بۆماوە لە بنەماڵەیەکی خاوەن پێگە و ڕەگەزێکی بە حساب باڵاوە، کە تا ئێستاش لە لایەن هەندێ نەتەوە و ناوچەوە کاری پێ دەکرێت.[19]

ئەوەی جێگای داخە، لە دوای سەردەمی ڕاشدینەوە بنەما مەدەنییەکانی دامەزراندنی دەسەڵاتی سیاسی فەرامۆشکران و لە جێگایان تیۆرەکانی هێز و زاڵبوون و میراتی و تەنانەت مافی پێسپاردن لە لایەن خوداوە بە شێوەیەك لە شێوەکان، بووە ڕێبازی حوکمڕانی کردن و سەرچاوەی تاکڕەوەی و ستەمکاریی سیاسی، بە درێژایی مێژووی میللەتانی موسڵمان بەردەوام بوو.

---

[19] نفس المصدر، الجزء الاول، ص٢٩٤.

ئەمڕۆ باشترین میکانیزم بۆ جێبەجێکردنی ناوەرۆکی شوورا و بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی گەل، بریتییە لە دیموکراتیەت و میکانیزمەکانی، بەو شێوەیەی کە لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا مومارەسە دەکرێت. بۆیە ئەرکی ڕەوتە ئیسلامییەکانە، ئەوانەی کە دەسەڵاتیان گرتووەتە دەست، یان بەڕێوەن بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات، بەبێ دوودڵی دیموکراتیەت بکەنە ڕێبازی حوکمڕانی کردن وەك ستراتیژ و ئامانج، نەك تەنها وەك تاکتیك و ئالیەت بۆ گەیشتن بە دەسەڵات. چونکە دیموکراتیەت و پرنسیپەکانی و میکانیزمەکانی بە گشتی و لە بواری حوکمڕانیدا بە تایبەتی، باشترین و گونجاوترین میکانیزمە بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ناوەرۆکی شوورا و بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی گەل و پابەندبوونی دەسەڵاتداران بە ئیسلام و شەریعەتەوە، ئامادەبوونیان بۆ هەموو لێپرسینەوە و لێپێچینەوەیەك و گەرەنتی دەستەبەرکردنی دادپەروەری بۆ سەرجەم هاووڵاتیان، ڕێگرتن لە گەندەڵی و دابینکردنی شەفافیەت لە ماڵ و دارایی گشتیدا، ئەمانە ئەو ئامانج و داخوازییانەن کە ئیسلام و شەریعەتی ئیسلامی داوای دەکەن. لەڕاستیدا کۆمەڵگە موسڵمانەکان کاتێك باس لە جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامی دەکەن، مەبەستیان بەرپاکردنی دادپەروەری و یەکسانی و پاراستنی کەرامەتی موسڵمانانە بە گشتی، نەك شتێکی تر. چونکە شەریعەتی ئیسلامی لەسەر بنەمای بەدیهێنانی دادپەروەری و دەستەبەرکردنی بەرژەوەندییەکان بۆ تاك و کۆمەڵ، دانراوە.

ڕەوتە ئیسلامییەکان بە گشتی و ڕەوتی ئیخوان بە تایبەتی، کە وەك دەردەکەوێت بەرپرسیارێتیی سەرەکی لەم قۆناغەدا ڕوویان تێدەکات.. پێویستە هەوڵ بدەن باشترین سوود لەم دەرفەتە مێژووییە وەربگرن، کە لەڕاستیدا (تحدی)یەکی گەورەیە ڕووبەڕوویان بووەتەوە و هەق وایە کارێك نەکەن کە خۆیان و جەماوەری ڕاپەڕیوی ناوچەکە جارێکی تر دووچاری نائومێدی و شکست ببنەوە. ئەوەش بەوە دەبێت کە نموونەی ئەزموونە ئیسلامییە سەرنەکەوتووەکانی سەدەی بیستەم دووپات نەکەنەوە و خۆیان خەریك نەکەن بە هەندێ مەسەلەی

ناگرنگ و ڕواڵەتی و لاوەکییەوە، بەڵکو کاری جیددی و بەرنامە بۆکراو بکەن بۆ دۆزینەوەی ڕێگاچارەی زانستییانە بۆ پاراستنی سەقامگیریی وڵات و گواستنەوە لە قۆناغی شۆڕشەوە بۆ قۆناغی بیناکردنەوەی دەوڵەت، چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان و دابینکردنی هەلی کار بۆ توێژی لاوان و چینە هەژار و نەدارەکان بە تایبەتی، دەستەبەرکردنی خۆشگوزەرانی بۆ هاووڵاتیان بە شێوەیەکی گشتی. دروشم و ئامانجەکانی شۆڕشەکانی گەلانی ناوچەکەش بۆ گەڕاندنەوەی سەروەریی میللەت و ڕێز و کەرامەت بۆ هاووڵاتیان و دابینکردنی ئازادی و دادپەروەری و یەکسانییە و لە ڕەگ و ڕیشە دەرهێنانی دیکتاتۆریەت و تاکڕەوی و گەندەڵییە، نەك بۆ هیچ شتێکی تر.

ڕەوتە ئیسلامییەکان پێویستە بە شێوەیەکی سیستماتیکی و دامەزراوەیی کاروباری دەوڵەت و حوکمڕانی کردن جیابکەنەوە لە کار و ئەرکی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی.. لایەنی بانگەواز و ئەمر کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە و بانگەشە کردن و ڕێزگرتن لە دروشم و ڕەوشت و ڕێنماییە ئیسلامییەکان، بە تەنها ئەرك و بەرپرسیارێتیی دەوڵەت نییە، بەڵکو ئەرك و بەرپرسیارێتی کۆمەڵگە و دامەزراوە ئەهلی و مەدەنییەکانیەتی. دەوڵەت و دەسەڵاتی سیاسی نابێ ڕاستەوخۆ بچێتە ناو ئەو مەسەلانەوە و شێوازێك لە ڕێنمایی و پابەندبوونی فیقهی بەسەر هاووڵاتیاندا بسەپێنێت، چونکە کۆمەڵگەی ئیسلامی یەکسان نییە بە کۆمەڵگەی فیقهی کە زۆرجار دەبێتە هۆی دروستبوونی نیفاق و دووڕوویی لە هەڵسوکەوت و ڕەفتار و چۆنێتیی دەربڕینی پابەندبوون بە ڕێنماییە فیقهیەکانەوە.

کۆمەڵگەی ئیسلامیی ڕاستەقینە بریتییە لە کۆمەڵگەیەك کە ئەندامەکانی بە گشتی یان زۆرینەیان بە شێوەیەکی هوشیارانە و شارستانییانە بە خواست و ئارەزووی خۆیان پابەندبن بە ڕەوشت و بەها ئیسلامییەکانەوە، بەبێ ئەوەی پێویست بە سەپاندن بکات لە لایەن دەوڵەت و دەزگاکانی دەوڵەتەوە. ئەوە

کۆمەڵگەی ئیسلامییە کە بەرپرسیارە بەرامبەر پاراستنی دروشم و بەها و ڕەوشتە ئیسلامییەکان و مافی ئەوەی هەیە بیسەپێنێت بەسەر دەوڵەت و دەسەڵاتی سیاسیدا، نەك بە پێچەوانەوە. هەرکاتێك پابەندبوون بە ئاین و ڕێنماییە ئاینییەکان خرایە دەستی دەوڵەت و دەسەڵاتی سیاسی، ئەوکاتە ئاین دەگۆڕێت بۆ ئایدۆلۆژیایەکی بێزراو و نەویستراو.

گوتاری ئیسلامی و بانگەوازی ئاینی لە بواری سیاسەتدا، بریتییە لە هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی دادپەروەری و ڕووبەڕووبوونەوەی ستەمکاری و گەندەڵی. کەواتە پەیامی ئاین لە ڕووی سیاسییەوە بریتییە لە هاندانی خەڵك بۆ بەدەستهێنانی دادپەروەری لەناو کۆمەڵگەدا و پابەندبوون بە ڕەوشت و بەها ئیمانییەکانەوە لە بواری سیاسەتدا.

ڕەوتە ئیسلامییەکان پێویستە لەم قۆناغە هەستیارەدا کە بە قۆناغێکی ڕاگوزەری دادەنرێت، هەوڵ بدەن ئیسلام وەك هەمیشە هۆکاری یەکبوون و پێکەوەژیانی نێوان هەموو پێکهاتەکانی کۆمەڵگەکانی خۆیان بێت و نەیکەنە بەشێك لە کێشە و ململانێکان لەسەر دەسەڵات.

چونکە سکاڵا و نیگەرانییەکانی گەلانی ڕاپەڕیوی ناوچەکە بۆ ئەوە نییە کە ئاین لاواز و بێناز کراوە یان دژایەتیی دەکرێت، بەڵکو کێشە و نیگەرانییەکانیان بەرامبەر گەندەڵی و دیکتاتۆریەت و ستەمکاریی سیاسی و خراپ بەکارهێنانی کاروباری گشتییە. ئەو خەڵکەش کە لە هەڵبژاردنەکاندا دەنگیان بە ئیسلامییەکان دەدەن، لەبەرئەوەیە کە ڕەوتە عەلمانییەکانی تر بە لیبراڵی و سۆشیالیستی و ناسیۆنالیست و..تاد..، هەموو تاقیکراونەتەوە و ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، بەشێك بوون لە واقیعە خراپەکە.. بەڵام ڕەوتە ئیسلامییەکان هێشتا بە تەواوەتی تاقینەکراونەتەوە و ڕابردوویان خاوێنە و خاوەنی قوربانیدان و خەباتن دژ بە ڕژێمە گەندەڵ و دیکتاتۆرەکان. لە لایەکی تریشەوە خەڵك ئومێدی بە دەستپاکی

و ڕەوشتی جوانیان هەیە و چاوەڕێی زۆریان لێ دەکەن بۆ دابینکردنی دادپەروەری و خۆشگوزەرانی و بنەبڕکردنی گەندەڵی.

لەو سۆنگەیەوە ڕەوتە ئیسلامییەکان ڕووبەڕوی تاقیکردنەوەیەکی چارەنووسساز بوونەتەوە، سەرکەوتنیان لەم تاقیکردنەوەیەدا بە تەنها سەرکەوتن نابێت بۆ خۆیان، بەڵکو سەرکەوتن دەبێت بۆ خۆیان و گەلەکانیان و جیهان بە گشتی. سەرکەوتنەکەشیان لەوەدا دەبێت کە بە هاوکاریی هەموو هێزە سیاسییەکانی ناو وڵاتەکانی خۆیان، بتوانن دەوڵەتی مەدەنی و دیموکراسی بە مەرجەعیەتێکی ئیسلامیی میانەڕەوانە و شارستانییانە دابمەزرێنن، کە هەموان لە سایەیدا هەست بە سەقامگیری و ئازادی و دادپەروەری و خۆشگوزەرانی بکەن. ئەوەش تەنها و تەنها بەوە دێتە دی کە دەوڵەتی مەدەنی دابمەزرێت و هاووڵاتیان بە گشتی و بە جیاوازیی ئاین و ڕەگەز و ڕەنگ و بیروڕایانەوە، یەکسان بن لەبەردەم یاسادا. کەواتە دەوڵەتی ئیسلامیی ڕاستەقینە بریتییە لە دەوڵەتی مەدەنی و دیموکراسی، چونکە لە سایەی دیموکراسیەت و پرنسیپەکانیدا بە تایبەتی هەڵبژاردنە گشتییەکان، هەندێ گوتە و دەستەواژەی مێژوویی هەیە ئەمڕۆ گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، وەك ئەوەی کە دەڵێت: (الناس علی دین ملوکهم)، بەڵام لە سایەی دیموکراسیدا پێچەوانە بووەتەوە و دەوڵەت و دەسەڵاتی سیاسی لە سیستمی دیموکراسیدا ناتوانێت ئاین و ناسنامەی میللەت فەرامۆش بکات، بەڵکو بە هەموو شێوەیەك هەوڵ دەدات خواست و هەستی میللەت و جەماوەر ڕەچاو بکات.

## ڕەوتی ئیسلامیی کوردی و بەرپرسیارێتی قۆناغەکە

ڕەوتی ئیسلامی لە کوردستان وەك ڕەوتە ئیسلامییەکانی تری وڵاتانی ناوچەکە، لەم قۆناغەدا ڕووبەڕووی (تحديات) و بەرپرسیارێتیی نوێ دەبێتەوە، چونکە لە هەموو حاڵەتێکدا کوردستانیش بەشێکی زیندووە لە ناوچەکانی

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دەکەوێتە ژێر کاریگەرێتیی ئەو ڕووداوانە و دەرهاویشتەکانی. جگە لەوەش کە خۆی خاوەنی کێشە و دۆزی خۆیەتی و پێویستی بەوەیە و مافی خۆشیەتی کە وەك گەلانی تری ناوچەکە، لە دەرفەت و دەسکەوتەکانی ئەم قۆناغە مێژووییە گرنگە سوودمەند بێت. لەو سۆنگەیەوە ڕەوتی ئیسلامیی کوردیش چاوەڕوانی زیاتری لێ دەکرێت و دەتوانێت لەم قۆناغە مێژووییەدا ڕۆڵی گەورەتر و کاراتر ببینێت.

ڕەوتی ئیسلامیی کوردی لە بەشەکانی تری کوردستاندا، واتە لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات و باکوری کوردستان، ئەگەر چی بە داخەوە لە ئاستێکی زۆر لاوازدایە، بەڵام لەم هەلومەرجە هەستیارەدا پێویستە لەناو جەرگەی ڕووداوەکاندا بن و بەشێکی جیانەکراوە بن لەو جموجوڵە جەماوەری و شۆڕشگێڕییەی کە بە شێوازی جیاجیا لەو وڵاتانەدا دەگوزەرێت، بەڵکو پێویستە لە ڕیزی پێشەوەی ڕووداوەکاندا بن و بە هیچ شێوەیەك لە ئەرك و بەرپرسیارێتی نیشتیمانیی و نەتەوەیی دوانەکەون.

هەرچی هەرێمی کوردستانیشە، کە دیارە تایبەتمەندێتیی خۆی هەیە، لە گشت ڕوویەکەوە بە قۆناغێکی هەستیاردا تێدەپەڕێت، بە تایبەتی دوای ئەوەی قەیرانی سیاسیی عێراق و پەیوەندییەکانی نێوان هەرێم و ناوەند لە هەر کاتێکی تر زیاتر ئاڵۆز بووە و دەرگاش کراوەیە لەبەردەم چەند ئەگەر و ئاکامێکی جیاجیادا.

ڕەوتی ئیسلامی لە هەرێمی کوردستاندا ئەگەرچی لە ئاستێکی زۆر پێشکەوتوودایە بە بەراورد لەگەڵ بەشەکانی تری کوردستاندا، بەڵام بەم حاڵەتەی ئێستایەوە مومکین نابێت لەوەی ئێستا زیاتری پێبکرێت. بۆیە پێویستی بەوەیە کە هەنگاوی پێشکەوتووتر و بوێرانەتر بهاوێژێت بەرەو یەکخستنی دید و گوتار و هەڵوێست لە ئاست مەسەلە سیاسییەکان و پەرەسەندنەکانی قۆناغەکەدا. پێویستە لەسەریان وردبینانەتر و دووربینانەتر گۆڕانکارییەکان و هاوکێشە

سیاسییەکان بخوێننەوە و لەو ڕوانگەیەوە ئەرك و بەرپرسیارێتیی خۆیان دیاری بکەن بۆ ئەم قۆناغە و هەر ئەگەرێکی تری چاوەڕواننەکراو لە ئایندەدا.

ڕاستە کە یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان لە دواکۆنگرەیدا لە سۆنگەی هەستکردن بە بەرپرسیارێتیی نەتەوەیی خۆی، هەنگاوێکی باشی ناوە بە چەسپاندنی مافی چارەی خۆنووسین بۆ گەلی کورد و کارکردن بۆ بەرەو پێشبردنی ئەزموونی سیاسیی کوردستان لە فیدراڵیەتەوە بەرەو دەوڵەت بوون.. بەڵام ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی ئەگەرچی مافێکی سروشتی و شەرعیی گەلەکەمانە، وەك هەر گەلێکی تری ناوچەکە و جیهان بە گشتی، زۆر گرنگ و پێویستە کە یەکگرتووەکان و لایەنەکانی تری ڕەوتی ئیسلامی و هەموو لایەك چاك دەرك بەو ڕاستییە بکەن کە ڕاگەیاندنی دەوڵەت یان هەبوونی دەوڵەت، ئەوە ناگەیەنێت کە دەبێتە چارەسەرێکی سیحری و موعجیزە ئامێز بۆ سەرجەم کێشە و نەهامەتییەکانی گەلەکەمان. بە لەبەرچاوگرتنی ڕووبەڕووبوونەوەی چەندین کێشە و دەرهاویشتەی تری نەخوازراو، چ لە لایەن دەوڵەتی مەرکەزی بەغداوە بێت، یان لە لایەن دەوڵەتانی تری دراوسێوە بێت، لە ئەگەری ڕاگەیاندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیدا.

پێویستە چاك لەو ڕاستییە بگەین کە شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی گەلانی ناوچەکە دژ بە داگیرکاری بیانی یان لەپێناو دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆدا نییە، چونکە گەلانی ئەو وڵاتانە لە ساڵانی دوای جەنگی جیهانیی دووەمەوە خاوەنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیانن و بە حساب لە لایەن هێزە نیشتیمانییەکانی خۆیانەوە حوکمڕانی دەکرێن. گەلانی ناوچەکە شۆڕش و ڕاپەڕینەکانیان دژ بە دکتاتۆریەت و تاکڕەوی و ناعەدالەتی و پێشێلکردنی ماف و کەرامەتی هاووڵاتیان و گەندەڵی و بەتاڵانبردنی سەروەت و سامانی وڵاتەکانیانە، کە لە لایەن دەستە و تاقمە حوکمڕانەکانی سەر بە گەلانی خۆیانەوە مومارەسە دەکرێت، لەژێر ناو و دروشمی بریقەدار و بێ ناوەرۆکدا.

ڕاسته كه دامه‌زراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی كوردی خەون و ئاواتی لەمێژینەی هەموو كوردێكە و ئەركی نیشتیمانی و نەتەوەیی هەموو هێز و لایەنە سیاسییەكانە و پێویستە هەموو لایەك كاری جیددی و بەرنامە بۆداڕێژراوی بۆ بكەن، بەڵام لەوە گرنگتر و پێویستتر ئەوەیە كە هەر لە ئێستاوە بنەماكانی دەوڵەتی یاسا و دەوڵەتی دامەزراوەیی و دەوڵەتی مەدەنی و دیموكرات، جێگیر بكرێت و بە هیچ پاساوێك دوانەخرێت بۆ دوای ڕاگەیاندنی دەوڵەت، بۆئەوەی ئەزموونی هەڵە و ترسناكیی ڕژێمە دیكتاتۆرییەكانی وڵاتانی ناوچەكە چیتر دووبارە نەبێتەوە بەسەر ئەم گەلە ستەمدیدەیەدا.

لایەنە سیاسییەكانی هەرێمی كوردستان بە گشتی و لایەنە دەسەڵاتدارەكان بە تایبەتی، لەم بوارەدا لەبەردەم تاقیكردنەوەیەكی چارەنووسسازدان، ئەوەی كە لەماوەی چەند ساڵی حوكمڕانی كردنی كوردیدا و تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت، مومارەسە دەكرێت، بەپێی پێوەرە جیهانییەكان لە ئاست بەدیهێنانی ئەو ئامانجە ستراتیژی و چارەنووسسازەدا نییە و دەوڵەتی مۆدێرن و مەدەنی و هاوچەرخی لەسەر دانامەزرێت. بۆیە لەم قۆناغەدا و پێش هەر هەنگاو و بڕیارێك لەبارەی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی سەربەخۆی كوردییەوە، ئەولەویەت بۆ ئەنجامدانی چاكسازیی ڕیشەیی و ڕاستەقینەیە لە سیستمی سیاسیی هەرێمی كوردستاندا و ئەركی سەرەكی و هەنووكەیی لایەنەكانی ئۆپۆزسیۆن بە گشتی و ڕەوتی ئیسلامی بە تایبەتی، لەپاڵ درێژەدان بە چالاكیی ئیسلامی و دەعەوی خۆیان، بە پلەی یەكەم لە ڕووی سیاسییەوە پێویستە ڕوو بكاتە ئەم ئامانجە گرنگە.

ئەو چاكسازی و گۆڕانسازییەی كە ساڵانێكە هێزەكانی ئۆپۆزسیۆن و ڕۆشنبیران و ڕێكخراوەكانی كۆمەڵگەی مەدەنی و زۆربەی زۆری جەماوەری كوردستان داوای دەكەن، بە تایبەتی لە خۆپیشاندانەكانی ڕۆژانی دوای ١٧/ شوباتی ٢٠١١ دا، بە شێوەیەكی جەماوەریی فراوان و بە زمان و شێوازی مەدەنییانە و سەردەمییانە تەعبیری لێكرا، خواست و داخوازیی ڕەوا و زەرورین و

باشترین ڕێگا خۆشکردنە بۆ گەیشتن بە ئامانجی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان.

ڕاستکردنەوەی ئاراستەی نادروستی شێوازی حوکمڕانی کردن لە ڕووی سیاسی و ئیداری و ئابوورییەوە، بەرجەستەکردنی ناوەڕۆکی چەمکەکانی دیموکراسی و دەوڵەتی یاسا و دەوڵەتی دامەزراوەیی و بێلایەنکردنیان بەرامبەر هەموو لایەك، ڕێزگرتنی تەواو لە مافەکانی مرۆڤ و دابەشکردنی دادپەروەرانەی سەروەت و سامانی وڵات و بنەبڕکردنی گەندەڵی و دوورخستنەوەی دەستتێوەردانی حیزب لە دامودەزگاکانی حکومەت، بنیاتنانی ژێرخانی ئابووری و گرتنەبەری سیاسەتێکی دروست و هاوسەنگ لەگەڵ هێزە سیاسییەکانی ناوەند و هێزە ئیقلیمی و نێودەوڵەتییەکاندا، هەموو ئەم خاڵانە ئەرك و پێشمەرجی پێویستن و باشترین گەرەنتین بۆ بەهێزکردنی باشتری ئەزموونی سیاسیی کوردستان و بەرەو پێشبردنی لە فیدراڵیەتەوە بەرەو کۆنفیدراڵی و ڕاگەیاندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان.

لایەنە ئیسلامییەکانی هەرێمی کوردستانیش بۆئەوەی بتوانن ڕۆڵی کاریگەرتریان هەبێ و بەشداریی جیددیتر بکەن لە بە ئەنجام گەیاندنی بەرپرسیارێتیی قۆناغەکەدا لە ڕووی سیاسی و نەتەوەییەوە، زۆر گرنگە، بەڵکو پێویستییەکی بنەڕەتیی قۆناغەکەیە هەموو پێکەوە کار بکەن بۆ داڕشتنەوەی پرۆژەیەکی سیاسیی نیشتیمانیی بەدیل، دیارە بە مەرجەعیەتی ئیسلامی و بە ئیلهام وەرگرتن لە تێگەیشتنی (مقاصد)ی بۆ چەمکی شەریعەت و چەمکی جێبەجێکردنی شەریعەت و چەمکی دەوڵەتی دیموکراتی. لە هەمان کاتدا درێژە بدەن بە ستراتیژیەتی ئۆپۆزسیۆنبوونی خۆیان بە هاوکاریی تێکڕای هێزەکانی تری ئۆپۆزسیۆن و گرووپەکانی فشار دروستکردن لەسەر لایەنەکانی دەسەڵاتی سیاسی هەرێم و ناچارکردنیان بۆ ئەنجامدانی چاکسازی ڕیشەیی بە شێوەیەکی

بەرنامە بۆکراو، یان ئەوەتا خۆیان لە ئایندەدا دەسەڵاتی سیاسی بگرنە دەست و پرۆژەی سیاسیی خۆیان لە گۆڕین و چاکسازیی ڕاستەقینە، جێبەجێ بکەن.

جێی خۆیەتی کە لایەنە ئیسلامییەکانی کوردستان هەوڵی جددی بدەن بۆ ئەوەی سوود لە ئەزموونی بەشداریی سیاسیی بزاڤە ئیسلامییەکانی وڵاتانی ناوچەکە و خۆیشیان وەربگرن، بە تایبەتی دوای ئەو هەلومەرجە نوێیەی کە لە دوای شۆڕشەکانی گەلانی ناوچەکە هاتووەتە کایەوە، لە پێش هەموویانەوە سەرکەوتنی بزاڤە ئیسلامییەکان. کاتی ئەوە هاتووە کە ئیلهام لەو سەرکەوتن و گۆڕانکارییە گەورەیە وەربگرن و سەقفی داواکارییەکانیان و فشاریان لەسەر دەسەڵات، بەرزبکەنەوە بۆ ئاستی پێداویستییەکانی ئەنجامدانی چاکسازیی سیاسیی ڕیشەیی و خواست و خەمەکانی جەماوەر. چونکە ئاشکرایە کە لایەنەکانی دەسەڵات لە هەرێمدا تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت، ئامادە نین لە هەڵبژاردنەکاندا دۆڕان قبوڵ بکەن و خۆیشیان ئیرادەی ئەنجامدانی چاکسازیی ڕاستەقینەیان نییە. بەڵام لەپێناو زامنکردنی مانەوەی خۆیان لە دەسەڵات، پێویستیان بە هاوکاریی ئیسلامییەکان هەیە و هەوڵ دەدەن لایەنە ئیسلامییەکان بکەنە بەشێك لە دەسەڵات و لەژێر کۆنترۆڵی خۆیاندا بیانهێڵنەوە.

لایەنە ئیسلامییەکانی کوردستان لەم قۆناغە نوێیەدا هەموو پێکەوە پێویستیان بە ستراتیژێکی نوێ و پرۆژەی سیاسی تایبەت بە خۆیان هەیە، کە بتوانن لە ڕێگایەوە لە هەر هەڵبژاردنێکی داهاتوودا زۆرینەی پەرلەمانی بەدەست بهێنن، یان بەلای کەمەوە کەمینەیەکی ڕێگر، بۆ ئەوەی بتوانن چاکسازیی سیاسی لە بەرژەوەندیی گەل و لە بەرژەوەندیی پرۆژەی سیاسیی خۆیان بەسەر دەسەڵاتدا بسەپێنن. ئەگەر وا نەکەن، بێگومان پاشەکشە دەکەن و متمانەی جەماوەری لە دەست دەدەن و پێگەی سیاسیشیان لەق دەبێت و پەراوێز دەبن.

لە ڕاستیدا لایەنە ئیسلامییەکانی کوردستان ئەگەر لە ڕووی دەعەوی و مەنهەجی پەروەردەییەوە ڕاوبۆچوونی جیاواز و شێوازی کاری تایبەت بە خۆیان

هەبێت، ئەوا لە رووی سیاسییەوە ئاشکرایە کە هیچ جیاوازییەکی جەوهەری لە نێوانیاندا نەماوە، چونکە هەموویان لە چوارچێوەی پرۆسەی دیموکراسیدا مومارەسەی کاری سیاسی دەکەن. بۆیە جێی خۆیەتی کە لە ڕووی سیاسییەوە لە چوارچێوەی پرۆژەیەکی نیشتمانیی نوێدا خۆیان ڕێك بخەن و بە گوتارێکی سیاسیی هاوبەشەوە مومارەسەی کاری سیاسی بکەن، بۆ ئەوەی بتوانن پێگەی سیاسی و جەماوەریی خۆیان بەهێز بکەن. چونکە لەم قۆناغە نوێیەدا کە ناوچەکەی پێدا تێدەپەرێت و رەوتی ئیسلامی دەسەڵات دەگرنە دەست، بەهێزبوونی پێگەی سیاسی و جەماوەریی ئیسلامییەکانی کوردستان لە بەرژەوەندیی دۆزی گەلی کورد تەواو دەبێت و دەبێتە فاکتەرێکی تەواوکار و پێویست بۆ دەستەبەرکردنی پشتگیری و هاوکاریی هەمەلایەنەی وڵاتانی ناوچەکە بۆ گەلەکەمان. ئەمەش بەپرسیارێتییەکی نیشتمانی و ئیسلامیی ئەم قۆناغە مێژووییەیە و پێویستە ئیسلامییەکانی کوردستان لە ئاستێکی پێشکەوتووتردا ئەنجامی بدەن.

# سەرچاوەکان


١- عبدالرحمن ابن خلدون، المقدمة، دار الهيثم- القاهرة، ط١/٢٠٠٥، الفصل الرابع عشر/ في ان الدول لها اعمار كما للاشخاص، ص١٣٦.

٢-د. جاسم سلطان، فلسفة التأريخ- الفهم الاستراتيجي للتأريخ، دار النشر ام القرى، سلسلة مشروع النهضة، ص٣٥.

٣-محمد حسنين هيكل، الزمن الامريكي من نيويورك الى كابل، ط٥، دار الشروق، القاهرة، ص٢٥.

٤- د. جاسم سلطان، قوانين النهضة- القواعد الاستراتيجية في الصراع والتدافع الحضاري، ص١٢.

٥- ياسر الغرباوي، حركات التغيير والحراك الجماهيري، ط١، ٢٠٠٧، ص٢١.

٦- د. محمد عياش الكبيسي، أنماط الشخصية واشكالات القيادة والتربية في العمل الاسلامي، دار اسامة للنشر، عمان، الاردن، ط١، ٢٠١٠، ص١١، ص٢٦.

٧- مجدي احمد حسين، سنن التغير في السيرة النبوية وتطبيقها على الحركات الاسلامية المعاصرة، المركز العربي للدراسات، ٢٠٠٩، ص١٨.

٨- ملحق خاص لمجلة الحراء، تقرير حول مستقبل الاصلاح في العالم الاسلامى، خبرات مقارنة مع حركة فتح اللة كولن التركية، جامعة الدول العربية- القاهرة، ١٩-٢١ اكتوبر، ٢٠٠٩، ص٢١-٢٢.

٩- علي حرب، ثورات القوة الناعمة في العالم العربي، بيروت - لبنان، ط١ ،٢٠١١، ص٩.

١٠- عبدالله المالكي، سيادة الامة قبل تطبيق الشريعة، ط١، الشبكة العربية للابحاث والنشر، بيروت، ٢٠١٢، ص٢٩.

١١- د. حاكم المطيري، تحرير الانسان وتجريد الطغيان، دراسة في أصول الخطاب السياسي القرآني والنبوي والراشدي، الجزء الثاني، ص٤٠٤.

# پێڕستی بابەتەکان

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك ـ ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خالانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئسیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الكليات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

– چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاڕاستەکردنی کاروانی ژیاریی مرۆڤایەتی و بەرچاورۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە، هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر لەوانەش:

– بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

– هاوکــاریی هـــەوڵ و کۆششـــی زانــا توێــژەرەوەکانی زانکــۆ و بنکــەکانی توێژینەوەی زانستیی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.

– ئاراستەکردنی توێژینەوە زانستی و ئەکادیمییەکان لـەپێناو خزمـەتکردن بـە فیکر و مەعریفە.

هــەروەها پــەیمانگا چــەند نووســینگە و لقێکــی لــە پایتــەختی وڵاتــە عــەرەبی و ئیســلامییەکان و وڵاتــانی تــریش هەیــە، کــە لــە ڕێگەیانــەوە کــار و چــالاکییە جۆراوجۆرەکانی خـۆی ئـەنجام دەدات، هـەروەها چـەند ڕێکەوتننامەیـەکی لەگـەڵ ژمارەیەك زانکۆی عەرەبی و ئیسـلامیی و خۆرئـاوایی لـە سەرانسـەری جیهانـدا بـۆ هاوکاریی زانستی هاوبەش، هەیە.

# سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

سەنتەرێکی کوردستانی ناحکومی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینـەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبـارە هێنانـەگۆی دەق و تێکسـتە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزانـدنی چـەمکە مـەعریفی و بەبایەخـەکانی ئیسـلام لـە بوارە جیاوازەکانی سـەردەمدا، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە هـزر و بـیری ڕەسـەن و قووڵ بنچـینەی تێگەیشـتنی ڕاسـت و دروسـتە بـۆ دەقـەکانی قورئـان سـوننەت و دەستەبەری لێکدانەوەی گونجاوە بۆیان، سەنتەر هەوڵی ڕەخساندنی کەشـوهەوای گونجاو دەدات بۆ کارابوونی عەقڵ و بـیر و ڕانـانی هزریـی، لـەم پێنـاوەدا سـەنتەر هەردوو سەرچاوەی قورئانی پـیرۆز و فـەرموودەی بـەرز و بـەڕێز بـە بـەکارهێنانی ئـامرازی زانسـتە ئیسـلامییەکان و زانسـتە کۆمەڵایـەتی و سروشـتییەکان دەکاتـە بنەمای کارەکانی.

**ئامانجەکانی سەنتەر:**

ــ بوژاندنــەوەی بـیرو هـزر و بەکارخسـتنی مەعریفـەی ئیسـلامی لـە ناوەنـدە زانکـۆیی و پەروەردەییەکانـدا، بـە پشتبەسـتن بـە بـەهرە و توانـا خودییـەکانی ئەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.

ـ پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.

ـ کاراکردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.

ـ پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.

ـ سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.

**بوارەکانی کارکردن:**

ـ نووسین بە قەڵەمی خۆماڵی نووسەرانی کورد و بیرمەندان.

ـ وەرگێڕان لە زمانە جیاوازەکان بۆ زمانی کوردی لە پێناو دەوڵەمەندکردنی کلتووری کوردی.

ـ بەستنی کۆڕ و سازدانی سیمینار لەلایەن خاوەن بیر و ئەکادیمیانەوە.

ـ خولی ڕاهێنان و ۆرکشۆپ لەلایەن کەسانی پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەی زانکۆییەوە.

ـ هاوکاریکردنی دامودەزگا و دامەزراوە ئەکادیمییەکان و زانکۆکان لە پێناو پەرەپێدانی ئاستی زانستی.